سريةٌ سِرّ . ما يكتمه الانسان من أمره : **ڕاز، کاروباری نهێنی و پەنهان**

سريعٌ ج سِرعان ) مسرع . بحر شعري : **خێرا ، کێشێکی هۆنراوەی عەرەبییە**

سطا وثب عليه وقهره : **هێرشی بردە سەر**

سطّر كتب . رسم خطوطا بالمسطرة : **نووسی ، هێڵی کێشا**

سطع الغبار او النور . انتشر وارتفع : **تۆزو خۆڵ بەرزو بڵاوبۆوە**

سطلٌ ج سطول واسطال ) اناء من نحاس او معدن : **سەتڵ ، پەقرەج**

سعادةٌ شعور بالبهجة والارتياح النفسي : **بەختەوەریی**

سُعالٌ طرد الهواء من الرئتين بقوة محدثا صوتا قويا : **کۆکە ، کۆخین**



سعةٌ اتساع . غنى : **فراوانیی ، دەوڵەمەندیی**

سعدانٌ قرد . نبات ذو شوك ترعاه الإبل : **مەیموون ، گیاوشترێلە**

سُعْرةٌ وحدة لقياس كميات الحرارة: **کالۆری، گەرمۆکە، یەکەی پێوانەی گەرمی**

سعل اخذه السعال : **کۆکەی گرت ، کۆخی**

سعى به . وشى به ونمّ عليه : **لە پاش ملە باسی کرد**

سعيدٌ ج سعداء ) الذي يشعر بالبهجة والارتياح النفسي : **بەختەوەر ، دڵشاد**

سعيرٌ ج سُعُر ) نار . لهب النار : **ئاگر ، بڵێسەی ئاگر**

سفّاحٌ كثير سفك الدماء : **زۆر خوێن ڕێژ**

سفّاك سفّاح . مكثر من سفك الدماء : **خوێن ڕێژ، پیاو کوژ**

سفالةٌ نذالة : **سووکیی ، بێ نرخ**

سفاهةٌ رداءة خلق : **بێ ڕەوشت**

سفحٌ ج سفوح ) من الجبل . أسفله : **بناری چیا**

سفرٌ (ج اسفار) قطعُ مسافةٍ : **گەشت**

سَفّرَ جعله يسافر ، اوقد ، أشعل : **گەشتی پێ کرد ، داگیرساند**

سَفْرٌ (ج سُفور) أثرٌ يبقى على جلد الإنسان : **ماك ، پەڵە**

سَفَرْجلٌ (ج سفارج) شجر يحمل ثمراً ذا رائحة عطريّة يؤكل نيئاً أو تُصنع منه المربيات : **بەهێ ، بی**

سفک الماء او الدم ، أسالهُ : **ئاو یان خوێنی ڕژان**

سفلوسفلوسفل ، إنحطّ ، كان سافلا دنيئاً : **نزمبوو ، سووك و بێ ئابڕووبوو**

سفيه جهل : **نەفامبوو**

سَفُهَ صار رديء الخلق : **بێ ڕەوشت بوو**

سَفيرٌ (ج سُفَراء) رسول ، مُصلِحٌ بين القوم : **باڵیۆز ، نێردراو ، ناوبژی كار**

سفير اسافِلُالزّرع : **خوارەوەی زەوی كشتوكاڵ**

سَفينَةٌ (ج سُفُن وسفين وسَفائن) مَركب ، باخِرة : **پاپۆر ، كەشتی**

سقاءٌ (ج اسقية و اسقيات واساقٍ) وعاء من جلد يوضع فيه الماء أولبنُ : **جەوەنده ، كونده ، مەشكە**

سقّاءُ من يحمل الماء إلى البيوت و نحوها : **ئاوكێش**

سقامٌ مرضٌ : **نەخۆش**

سقايةٌ ما يُبْنى من سدّ أو غيره لجمع الماء : **شوێنی كۆكردنەوەی ئاو**

سقَطُ (ج أسقاط) جُناح الطائر . ما يسقط من الندى أو ثلجٌ : **باڵی باڵندە ، ئەوەی دەكەوێتە خوارەوە لە شەونم و بەفر**

سقطةٌ (ج سقاط) وقعة شديدة : **كەوتنێكی توند**

سقِم مرض أو طال مرض : **نەخۆش كەوت**

سقى الرجل . اعطاهُ ماء ليشرب : **ئاوی پێدا بۆ خواردنەوە**

سقى الحيوان أو النّبات ، أرواهُ : **تێر ئاوی کرد**

سقيفةٌ (ج سقائف) بناء بارز خارج البيت : **ئەو ژوورەی لە دەرەوەی ماڵە**

سقيفة لوح السفينة ، ضلع الجمل : **پارچەی کەشتی، پەراسووی وشتر**

سقيمٌ (ج سُقْم وسقام وسُقماء) مريض ، ضعيف ، كلامٌ سقيمٌ ، غير صحيح : **نەخۆش ، لاواز ، نادروست**



سكّافٌ صانع الأحذيةِ والخفاف :

**پیشەی کەوش دووری ، پێڵاو دووری**

سكاكِرُ حلويات: **شەکرۆکە شیرنەمەنی**

سكبٌ رَصاصٌ او نحاسٌ : **قورقوشم ، مس**

سكتَ الرّجلُ ، صمت ، مات : **بێ دەنگ بوو، مرد**

سكتَ الغضبُ ، سكن : **دامرکایەوە**

سكر الكأس ، ملأها ، الباب سدّه : **پڕی کرد ، دەرگای پێوەدا**

سكر النّهر جعل له سدّاً : **پردی بۆ دروست کرد ، بەنداوی لەسەر دروست کرد**

سكرٌ سكْرانٌ : **مەست و سەرخۆش**

سُكّريٌّ مرضٌ من علاماته كثرةُ البول وشدّة العطش : **نەخۆشی شەکرە**

سكن البيت أو في البيت ، أقام فيه واستوطنهُ : **تێیدانیشتەجێ بوو**

سكْنٌ أهل البيت ، بيت : **جێنشینانی ماڵ ، ماڵ**

سكن وقفت حركته ، هدأ : **لە جووڵە وەستا ، ئارامبۆوە**

سكُوتٌ كثير السُكوت : **زۆربێ دەنگ**

سكوت ميّالٌ إلى إلتزام الصمْت : **مەیلی بێ دەنگی هەیە**

سُكونٌ هدوء ، قرار : **هێمن ، سرەوتن**

سِكّيرٌ كثير السُّكر : **زۆرمەست ، بەردەوام سەرخۆش**

سِكّينٌ ج سكاكين ، مُدية : **چەقۆ ، کێرد**

سَكينةٌ امرأة خفيفة الروح نشيطة : **ئافرەتی ڕوح سوکی گورج و گۆڵ**

سَكينةٌ طمأنينة ، استقرار : **دڵنیایی ، ئاسایش و هێمنی**

سُلٌّ مرض يصيب الرئة ، هزال : **نەخۆشیی سیل ، لاوازی**

سَلَّ ذهبت أسنانه : **دانەکانی کەوتن**



سَلَّ الشيء من الشيء ، إنتزعه : **بە هێمن و لەسەرخۆ لێی دەر هێنا**

سَلأ السمن ، صفّاه ، إستخرج الدهن : **پاڵاوتی ، ڕۆنەکەی گرت**

سِلاحٌ ج أسلحة و سلح آلات الحرب وأدوات القتال : **کەلوپەلی جەنگ ، چەك**

سَلاسةٌ سهولة ، انقياد ، لين : **ئاسانی ، ڕەوانی ، نەرمی**

سَلّالٌ بائع السلال أو صانعها : **سەبەتە فرۆش ، سەبەتە چن**

سُلالةٌ ما استُلّ من الشيء وانتزع : **دەری هێنا**

سلالة نسل و ولد : **نەوەو وەچە**

سَلامٌ من أسماء الله تعالى ، تحية المسلمين : **ناوێکی جوانی پەروەردگارە ، سڵاوکردنی موسڵمانانە**

سَلامةٌ من العيوب : **بێ خەوشیی**

سَلِبٌ طويل خفيف الحركة : **سست ، درێژ**

سلب الشيء من غيره ، انتزعه منه قهرا : **بەزۆر لێی زەوت کرد**

سلبت المرأة عقله ، استهوته واستولت عليه : **هۆشی نەما ، عەقڵی نەما**

سلّة (ج سلال) وعاء . من قصب او غيره : **سەبەتە ، قولینە**

سلخ جلد الذبيحة . كشطه ونزعه : **پێستەکەی گرواندو داماڵی**

سلخ موضع الماء . حفرة : **هەڵی کەند**

سلس لان . انقياد . سهل : **نەرم بوو، ڕەوان بوو ، ئاسان بوو**

سلسل ربط الاشياء بعضها ببعض : **شتەکانی بەیەکەوە بەستەوە**

سلسل الدابة وغيرها . قيدها : **بەستییەوە**

سلسلة (ج سلاسل) حلقات يتصل بعضها ببعض : **زنجیر**

سلط طال لسانه : **زمان درێژبوو**

سلطان (ج سلاطين) حجة . ملك : **بەڵگە ، پاشا**

سلطة تسلط . قدرة : **دەسەڵات ، بەتوانا**

سلف (ج اسلاف وسلاف) كلّ عمل صالح قدّمه الإنسان : **هەموو کارێکی چاکە مرۆڤ پێشکەشی بکات**

سلف تقدم . سبق : **پێش کەوت ، تێ پەڕی**

سلفة (ج سلف) قرض : **قەرز**

سلفة قليل من الطعام يقدم الى الجائع قبل الغداء : **بەرکۆڵ**

سلق نبات اخضر يؤكل مطبوخا . ذنب : **سلق ، گورگ**

سلق البيض والخضر. اغلاه في الماء : **هێلکەی کوڵاند، سەوزەی لە ئاودا کوڵاند**



سلك المكان . دخل فيه : **چووەناوی**

سلم نجا : **رزگاری بوو**

سلم (ج اسلم وسلام) سلم . مسالم : **ئاشتی ، ئاشتیخواز**

سلم عليه.حياه بالسلام. رضي بالحكم: **سڵاوی لێ کردڕازی بوو بەفەرمانو بڕیا**

سلم سلام . استسلام : **ئاشتی ، قایل بوون ، خۆ بەدەستەوەدان**

سُلَّم (ج سلالم وسلاليم) ما يُتوصَّل به إلى شيء ما : **پەیژە ، قالدرمە**

سلمون سمك كبير يعيش في الأنهار والبحار : **ماسیە خاتوونە**

سلوقيُّ نوع من أحسن أنواع كلاب الصَّيد : **سەگی ڕاو ، تاژی**

سلوى كلُّ ما يُسلي . عسلٌ : **هەموو شتێکی دڵخۆشکەر، هەنگوین**

سلوى طائر السُّماني : **شیلاقە**

سلى (ج أسلاء) غشاء رقيق يكون في الجنين في بطن أمه : **ویلاش**

سليبٌ (ج سلبى وسلب)مسلوب المال أو العقل : **تالآنکراو، بردراو، هۆشی نەماوە**

سليطٌ (ج سلطاء) خشنٌ : **زمان ڕەق ، زمان زبر**

سليط فصيحٌ حديد اللسان : **ژنی بەدگۆی زمان درێژی زبر**

سليقةٌ (ج سلائق) طبيعة : **سروشتی**

سليقة ما يسلق من اللحوم و البقول و البيض : **کوڵاو**

سليمٌ (ج سلمى وسلماء) سالمٌ من الافات والعيوب : **ساغ ، ساخ**

سمَّ سقاه سمّاً . سدَّ . احرق : **ژەهری دەر خوارددا ، دایخست ، سوتاندی**

سُمٌّ ( ج سُمُوم وسيهام) كلّ مادة قاتله من الأدوية أو الأطعمة : **ژەهر**

سما علا وانفع . طمح : **بەرزبۆوە ، چاوی تێ بڕی**

سماءٌ (ج سماوات وسموات) ما يحيط بالأرض من الفضاء الواسع : **ئاسمان**

سماء سقف كلّ شيء : **سەقف و بانی هەر شتێك**

سماخ بيوت من جلد : **ماڵی لە پێست**

سماحةٌ جُودٌ ، كرمٌ ، سُهولة : **میهرەبانی ، بەخشندەیی ، سادەیی**

سمادٌ (ج اسمدة) مادّة حيوانيّة او كيماويّة توضع في الأرض لتخصبها وتغذّي زرعها : **پەین**

سمّاعةٌ آلة يسمع بها الطبيب نبض قلب المريض : **بیستەك ، دەنگەوەرە**



سُماقٌ خالصٌ ، بحْتٌ : **پوختە ، پەتی ، سماق**

سمّاكٌ بائعُ السَّمك : **ماسی فرۆش**

سمّانٌ بائع السَّمن : **رۆنفرۆش**

سِمةٌ علامة، اثر : **نیشانە، شوێنەوار**

سمُج قبُح ، خبُثَ : **ناشرینبوو، پیسبوو**

سمّح سهّل ، ليّنَ : **ئاسانی کرد ، نەرمی کرد**

سمح بكذا ، جادَ ، اذن ، اعطى : **جوامێری نواند، ڕێیدا ، بەخشی**

سمد قام مُتحيّراً : **بەسەر سامیەوە هەڵسا**

سمر الخشب وغيره . ثبّته بالمسامير : **بزمار ڕێژی کرد**

سُمْرةٌ لونٌ بين السّواد والبياض : **ئەسمەر**

سمْسارٌ (ج سماسرة وسماسير ) وسيط بين البائع والشاري : **دەلاڵ**

سمْسرةٌ حرفة السّمْسار : **جامبازی**

سمْسِمٌ ( ج سماسيم) نبات فيه بزور صغار : **کونجی**

سمع أصْغى ، أطاع ، فهم : **گوێ ی گرت ، گوێڕایەڵبوو ، تێ گەیشت**

سمْعٌ (ج أسْماع وأسْمُع) حسُّ السّمع ، أذُنٌ : **هەستی بیستن ، گوێ**

سَمْعَةٌ شُهْرَةٌ : **ناوبانگ**

سمكٌ (ج اسماك وسماك وسُمُوك) حيوان مائي : **ماسی**



سمل الثوب بلي : **كۆن بوو**

سمّم الطعام ، وضع فيه السمّ : **ژەهری تێ کرد**

سمْنٌ (ج اسْمُنٌ وسمُون) مادة تُستخرج من اللبن بالمخض : **رۆنەکەرە**

سَمِنَ كثرُ لحمه وشحمهُ : **قەڵەو بوو**

سَمّى ذكر اسم الله ، جعل له إسما : **ناوی خوای هێنا ، ناوی لێنا**

سَمِينٌ (ج سمان) كثير اللحم والشحم : **قەڵەو**

سنّ السكين ، شحذه : **تیژی کرد**

سن الطريقة سار فيها : **ڕێگای گرتەبەر**

سنا البرقُ ، اضاء : **درەوشایەوە**

سنا السماءُ ، أمطرت : **باری**

سناءٌ علوٌ ، رفعة : **بەرزی**

سنامٌ (ج اسنمة اشريف ، اعلى الشيء ، حدبة في ظهر الجمل والناقة : **مەزن ، لوتکە ، سەرەوە ، كۆپارەی پشتی وشتر**

سنانٌ (ج اسنة) نصال الرُّمح : **سەرەڕم**

سُنْبُلٌ (ج سنابل) الجزء الاعلى من بعض النبات كالقمح والشعير : **گوڵە دانەوێڵە وەکو گەنم و جۆ**

سنّة (ج سنن) طريقة ، سيرة ، شريعة: **ڕێگا ، ژیاننامە ، شەریعەت ، ڕێباز**

سِنَةٌ نعاس يتقدمُ النوم . غفلة . نسيان : **وەنەوز ، بێئاگایی، لەبیر چوون**

سِنْجابٌ (ج سناجب وسناجيب) حيوان من القوارض : **سمۆرە**

سَنَح تيسَّر . جاد وسمح . عرض : **رەخسا ، لێبووری ، خستیە ڕوو**

سَنَّدَ الشيء . دعمه و وطَّده : **پاڵپشتی کرد و پتەویکرد**



سُنْدُسٌ نوعٌ من نسيجُ الحرير : **ئاوریشمی نەرم**

سِنْديانٌ شجر ضخم : **دار بەڕوو**

سَنَّ الأسنان . سوَّكها : **سیواکی کرد**

سِنَّوْرٌ (ج سنانير) هرٌّ . قطٌّ : **پشیلە**

سُنُونُو نوعٌ من الخطاطيف : **پەرەسێلکە**



سَنِيٌّ رفيع : **بڵند و بەرز**

سُنِّيٌّ منسوبٌ إلى أهل السُنَّة : **سوننی**

سها الشَيء . غفل عنه ونسيهُ: **لێی بێ ئاگابوو**

سُهادٌ أرقٌ . ذهابُ النوم : **خەوزڕان ، شەونخونی**

سهد ذهب عنه النوم . أرق : **خەوی لێ زڕا،خەوی زڕا**

سهر لم ينمّ كلّ الليل او بعضه : **شەونخونی کرد**

سهّل الامر . سَرَّهُ . صيَّرهُ سهلاً : **ئاسانی کرد، بۆی ئاسان کرد**

سهْلٌ (ج سُهول) أرض ممتدَّة مُنْبسطة : **دەشت**

سهْمٌ (ج سهام) قدحُ المَيْسر يلْعبُ به : **تیری قومارو یاری**



**سهم** عودٌ يُسوّى في طرفه نصل

ترميه القوس : **تير**

**سَهَمَ** تغيّر لونه من ضعف أو

همّ : **رەنگی گۆڕا**

**سَهْو** غفلةٌ و ذُهولٌ عن الشيء :

**بێ ئاگایی**

**سوء** (ج أسواء) فساد : **خراپ**

**سَواءٌ** مُتساوٍ . مثل . وسطُ الشيء : **یەكسانە، وەكو، ناوەڕاست**

**سَواد** (ج أسودة) نقيض بياض . شبحٌ : **رەشی ، تارمایی**

**سُوار** (ج أسورة و أساور وأساورة) حلية كالطوق تلبسها المرأة في معصمها أو

زندها : **بازن**

**سِواكٌ** (ج سُواك و أسوكة) عود تُستَن به الأسنان وتُنظّف : **داری سیواك**

**سواد** ماكان لونها أسود : **ڕەش**

**سُودانِيٌّ** واحد السُّودان . أسود اللون : **سودانییەك ، ڕەشپێست ، كەسێكی ولاتی سودان**

**سوَّر** المدنية ، جعل لها سورا : **سنووری بۆ دانا ، دەوری گرت**

**سور** المرأة . ألبسها سوارا : **بازنی كردە دەستی**

**سُورةٌ** (ج سُور وسُور وسُورات) واحدة سُور القرآن الكريم : **یەك سورەتی قورئان**

**سُوسٌ** دود يعيش في الصوف والخشب والحبوب : **خۆرە ، كرمی دار مۆرانە**

**سوس** شجرٌ يصنع من عروقة شرابٌ : **درەختی بەلەك**

**سَوْسَنٌ** (ج سواسن) جنسُ زهر طيّب الرائحة : **گوڵی شلێر**

**سَوْطٌ** (ج سياطو أسواط) ما يُضرب به من جلدٍ ونحوه : **قامچی و شتی تر**

سوّغ الأمر ، جوّزه وأباحه : **شياندى**

سوْفَ حرف تسويف للاستقبال : **له زمانی عەرەبی بۆ له مەولا بەكاردێت**

سُوقٌ (ج أسْواق) مكان تُباعُ فيه البضائع : **بازاڕ**

سوق الحرب ، ساحة القتال : **مەيدانی جەنگ**

سِوى (ج أسْواء) أداة استثناء ، عَدْلٌ ، بدلٌ:**جگە، دادپەروەری ، بەرامبەر بەيەك**

سَوَّى الشَّيءَ ، جعله سويًا : **هاوتای كرد ، تەختی كرد**

سَوَّى بينهما،عدَل : **دادپەروەری كرد له نێوانیاندا، بەيەك چاو تەماشايانی كرد**

سَوِيٌّ (ج أسْوِياء) مستو : **تەخت ، ڕێك و ڕاست**

سِياجٌ (ج سُوج و أسْوِجة) سُورٌ ، ما يُحيطُ بالشّيء من حائط او شوك : **پەرژین ، دیوار ، شورە ، پەرژین**

سَيَّارَةٌ قافلة ، مركبة : **ئۆتۆمۆبیل ، كاروان ، بارهەڵگر**

سياسَةٌ فن الحكم وإدارة أعمال الدّولة وشؤون المواطنين : **هونەری بەڕێوەبردن و كاروباری هاوڵاتیان**

سياسيٌّ الذي يُعنى بشؤون السياسة : **سیاسەتمەدار**

سِياقٌ مهر المرأة : **مارەیی**

سِياقُ الكلام ، اسلوبهُ : **شێوازی گفتوگۆ ، لەكاتی قسەكردن**



سَيَّجَ البستان ، جعل له سياجا : **پەرژینی بۆ كرد**

سيجارٌ لفافة تبغ : **جگەرە ، چەروت**

السَّيِّدة لقب (مريم) والدة السّيد المسيح عند المسيحيّين : **(ئەلسەیدە) ناز ناوی (مەریەمە) لای دیانەكان**

السيدة لقب كلّ امرأة : **گەورە ژن ، خانم و خاتوون**

سَيْرٌ(ج سُيُور وأسْيار)قطعة من جلد مستطيلة: **پارچەیەك لەپێستی لاكێشەیی**

سیرةّ (ج سیر) سُنَة ، طریقة ، مذهب : **تەریقەت ، رێباز، رێگا ، رێچکە**

سَیْطر تسلط ، اخضع ، راقب : **زاڵ بوو ، ملی پێ کەچ کرد ، چاودێری کرد**

سَیْفٌ (ج سُیُوف واسیاف) سلاح ذو نصل طویل : **شمشێر**

سَیَّل أجری ، أذاب الماء : **قلْپی کردەوە ، توانیەوە**



سینما دارٌ لعرض الافلام : **سینەما**

سَيّءٌ قبیحٌ ، ضِدُّ جیّد : **ناشیرین ، خراپ**



## بابُ الشين ، بەشی پیتی ( شین)

ش الحرف التالث عشر من حروف الهجاء: **پیتی سیانزەهەمە لەڕیزبەندی پیتە هیجائییەكان**

شُؤْمٌ مُتَشائِمٌ : **نەگبەتی ، ڕەش بین**

شاءَ أراد : **ویستی**

شائِبٌ (ج شُيَّب) مُبْيَضُّ شَعر الراس : **سەرسپی**

شائبةٌ شيء مختلط بغيرد وهو ليس من جنسه ، دنَسٌ وسَخٌ ، عَيْبٌ **شتێكی نامۆ تێكەڵ بە شتێكی تر ببێت ، پیسیی ، كەم و كوڕی**

شائِعٌ مُنتشر : **بڵاو**

شائعةٌ (ج شوائع) خبرٌ غير ثابت يتناقله الناس في ظرف من الظروف : **دەنگۆ، پڕوپاگەندە**

شائِكٌ و شولِر ، امرُشائك ، شديد عسير : **دڕكاوی، سەخت**

شائِنٌ مَعيبٌ : **حەیابەر**

شابٌّ (ج شباب وشُبّان) مَنْ كان في سنّ الشّباب : **گەنج ، لاو**

شابَ الشيء بالشيء ، خلطه بِهِ : **تێکەڵی کرد**

شابَكَ بين الأشياء ادخل بعضها في بعضٍ : **کردی بەنێویەکدا**

شابَهَ صار مثله : **وەکو ئەوی لێهات**



شاةٌ(ج شاءٌ وشياهٌ)واحدة من الغنم للذكر والأنثى

: **مەڕێك، بەرانێك، کاوڕێك**

شاجَرَ خاصم :**جوو بەگژیاشەڕی لەگەڵ کرد**

شاحِبٌ متغيّر اللون : **ڕەنگ تێکچوو** ، ڕەنگی زەرد بوو

شاحب مهزول من مرض أوجوع : **لەڕو لاواز**

شاحِنَةٌ سيّاته كبيرة تُشحَن بالبضائع : **بارهەڵگر**

شاخَ صار شيخاً : **پیربوو**

شاخِصٌ شيءٌ مائل ، علامة بارزة : **لار، نیشانەی دیار و ئاشکرا**

شادَ البناء ، دفعه : **بەرزی کردەوە**



شادن ولد الغزال : **فەرخە مامز**

شاذ (ج شواذٌ وشُذّاذٌ) خارج عن المألوف : **ناوازە**

شارَ العسل ، استخرجه من خليّته : **هەنگوینی لە شانەکە دەرهێنا**

شارِبٌ (ج شوارب) ما ينبت على ظاهر الشفة العليا من الشَّعر : **سمێڵ**

شارَةٌ محسنٌ وجمالٌ ، هيئة : **جوانی، شێوە**

شارِدٌ(ج شردٌ وشوارِدُ وشُوارِدُ وشُرَّد وشُرّاد)نافرٌ مُستَعصٍ : **ڕاکردووی یاخی**

شارد حائدٌ (عن الطريق) : **وێڵ**

شارعٌ (ج شوارع) طريق رئيس من طرق المدينة : **ڕێگای سەرەکی ، شەقام ، جادە**

شارف الشيء ، نظر إليه من فوق : **لەسەرەوە بۆی ڕوانی**

شارفهُ فاخره في الشَرف : **شانازی به بنەماڵە کرد**

شاسعٌ بعيد : **دوور**

شاشٌ نسيج رقيق من القطن : **کەتانی تەنك**

شاشةٌ ستارٌ تُعرضُ عليه الأفلام : **شاشە**

شاطرٌ (ج شُطّار) متَّصف بالدَهاء والخباثة : **زیرەك ، زۆرزان ساختەچی**

شاطِئٌ (ج شَواطي وشُطْآن) من البحر : ساحلةٌ : **کەناری دەریا ، لێواری دەریا**

شاع الخبرُ : انتشرَ : **بڵاوبۆوە**



شاعرٌ (ج شُعَراء) قائل الشِّعْر : **شاعیر ، هۆنەر**

شاعريّةٌ موهبة الشِّعر : **بەهرەی هۆنراوە نووسین**

شاغرٌ خالٍ : **بەتاڵ**

شافعٌ شفيع ، مُعين : **تکاکار، یارمەتیدەر**

شافهٌ عطشانٌ ، ظمآنٌ : **تینوو**

شاقٌّ مُتعب ، صعب : **ماندوو ، سەخت و دژوار**

شاقُولٌ (ج شواقيل) ميزان البنّائين والمهندسين والفلكيّين : **شاووڵ**

شاكٍ مُشتَكٍ : **بە گومان**

شاكٍ منْ يمرضُ مرضاً خفيفاً : **سوکە نەخۆشی**

شاكرٌ (ج شُكّر و شاكرون) حامدٌ : **سوپاس گوزار**

شاكر معترف بالمعروف : **پێزان**

شاكس شاغب : **ئاژاوەی گێڕا**

شاكل ماثل ، شابه : **هاوچەشنی بوو ، هاوشێوەی بوو**

شاكلةٌ (ج شواكل) خاصرةٌ ، شكلٌ : **لاتەنیشت دۆخ ، شێوە**

شاكلة طريقةٌ ومذهبٌ : **ڕێباز و مەزهەب ، نییەت**

شال الشيء ، رفعه :بەرزی کردەوە

شامةٌ (ج شام وشامات) بثرة أو نقطة في البدن تميل إلى السواد : **خاڵ و فینچکەی نوختەی ڕەشی سەر پێست**

شامِت (ج شمّات) الذي يفرح بمصيبة الآخرين : **ئەوەی بەخەم و نسکۆی یەکێکی تر شادو خۆشحاڵ دەبێت**



شامِخٌ فخور ، عال : **خۆهەڵکێش ، بەرز**

شامِلٌ عامٌ : **گشتی**

شأنٌ (ج شؤون) ما عظُم من الأمور : **کاری مەزن**

شان منزلةٌ وقدرٌ ، حالٌ ، خطبٌ : **ڕێزو پلەو پایە ، بار**

شانَ صار له شانٌ ومنزلة : **پلەو پایەی بوو**

شاهَ وجههُ قبُحَ : **ناشیرین بوو**

شاهدٌ (ج شهود وأشهاد) من يُخبر مما شهدهُ ، دليلٌ: **گەواهی دەر،بەڵگە،شایەت**

شاهقٌ مرتفعٌ ، عال : **بەرزوبڵند**

شايٌ نبات فيه موادُ منبهة يُغلى ورقة يُشرب ماؤه : **چا**

شبَّ الغلامُ ، أدرك طور الشباب : **بوو بەلاو**

شِبابٌ ما تُشعلُ به النّار : **ئەوەی ئاگری پێ هەڵدەگیرسێ**

شُبّاكٌ (ج شبابيك) نافذة : **پەنجەرە**

شبَث (ج أشبات) عنكبوت : **جاڵجاڵۆکە**

شبث دابةٌ صغيرةٌ كثيرة الأرجل : **هەزار پێ**

شبح الرّجل ، مدّه ليجلده : **درێژی کرد و بە قامچی لێیدا**

شبح الشيء شقّه : **دوولەتی کرد**

شبرٌ عطيةٌ ، خيرٌ : **بەخشش، خێرکردن**

شبعٌ إمتلاء من الطعام واكتفاء به : **تيربوون**

شبِع عقلهُ .كان واخراً متينا : **عمقلّ و بيری فراوان و پتموبوو**

شبْعانٌ (ج شباع) ممتلئ من الطعام : **تير**

شبك الشيء . انشب بعضه في بعض : **گمیاندی بمیمك**

شبكةٌ (ج شباك و شبك) شرك الصيّاد أو حباله من البرّ والبحر : **تۆڕی ڕاو**

شبْلٌ (ج آشبال و آشبُل وشبال) ولد الأسد : **بەچكە شێر**

شُبِّه عليه الأمرُ.لُبّس وخلط عليه : **لێی تێكەڵ بوو**

شبْهٌ (ج أشباهٌ ومشابه) مثلٌ : **وەكو**

شُبْهةٌ (ج شُبه وشُبهات) إلتباس : **گومان**

شبيبةٌ مرحلة العمر من البلوغ إلى نحو الثلاثين : **گەنجێتی**

شبيهٌ (ج شباه واشباه) مثْلٌ : **وەكو**

شتّ فرّق : **جیابۆوە**

شتاتٌ (ج أشتات) مُتشتّتٌ ومُتفرّق : **جیاجیا**

شُتامٌ قبيحُ الوجه : **ناشیرین**

شتّامٌ كثير الشّتم . سبّابٌ : **جنێوفرۆش ، دەم پیس**

شتّت فرّق : **جیای كردەوە**

شتَل الشّتل. قلعهُ ليغرسه في مكان آخر: **هەڵی كەند تا لەشوێنێكی تر بیروێنێ**

شتْلةٌ (ج شتْل) ما قُلع من نبات ليُغرس في مكان آخر : **نەمام**

شتُم صار كريه الوجه : **ڕوو گرژو ناشیرین بوو**

شتويٌ نسبةً إلى فصل الشتاء : **زستانی**

شتّى إستقرّ في مكانٍ ما في فصل الشتاء : **له زستاندا له شوێنێك جێگیر بوو**



شتيتٌ (ج شتتَّى) متفرِّق : پەرش و بڵاو

شتيمةٌ (ج شتائم) سبٌّ : جنێو

شجَّ رأسَه . جرحه . كسرهُ : برینداری کرد، سەری شکان

شجا أحزنه : غەمباری کرد

شجاً حُزنٌ . همٌّ : پەژارە و خەفەت

شجا ما اعترض في الحلق من عظم ونحوه : ئەوەی لە قوڕگ عاسێ دەبێ

شجارٌ نزاع . خصام . عراكٌ : دەمەقرە ، جەنگ ، شەڕ

شُجاعٌ جريء . باسل : ئازا ، مەرد

شَجاعةٌ جرأة وإقدام و رباطة جأس : ئازایەتی و جوامێری

شَجَّةٌ (ج شجاج) جرحٌ في الرأس : برینی سەر ، شکانی سەر

شَجَّرَ المكان . غرسهُ شجراً : داری لێ چاند



شَجَرَ بينهم أمرٌ . تنازعوا فيه : دەمەقاڵێیان بوو

شُجُعٌ عُروق الشَجر : ڕەگی درەخت

شَجِنَ حزن : خەمناك بوو

شَجْوٌ حزنٌ ، همٌّ : خەفەتبار

شجيَ حزن : خەفەتبار بوو

شُحٌّ بُخلٌ . حرصٌ : ڕەزیلی ، چروکی

شحَّاذٌ (ج شحاحذة وشحاذون) . سائلٌ : دەرۆزەکەر ، سواڵکەر

شحاذةٌ حرفة (شحاذ) : دەرۆزەکەری ، سواڵکەریی

شحبَ لونُه . تغيّر من مرضٍ أو جوعٍ :ڕەنگی گۆڕا لەبەر نەخۆشی و برسێتی ، ڕەنگی زەرد بوو

شحذَ السكين . سنَّه . الشيء قشرهُ : تیژی کرد ، توێکڵەکەی لێکردەوە

شَحْرُورٌ (ج شحارير) طائر أسودُ حسن الصوت : **بالندەیەکی ڕەشی دەنگ خۆشە**

شحَم لبّنها بالشّحم : **چەوری کرد**



شحْمٌ (ج شُحوم) مادّة دهنيّة لزجة : **بەز**

شحْنٌ ماتُشحن به السفن أو القطر الحديديّة أو السّيارات من البضائع : **بار لێنان ، بارکردن**

شحْناءُ عداوة وحقدٌ وبغضاء : **قین**

شَحيحٌ (ج شحاح و اشحّة و أشحّاء) كثير البخل : **ڕەزیل ، چرووك ، پیسکە**

شحيمٌ سمين : **قەڵەو**

شَخْصٌ (ج اشْخاص و شُخُوص) إنسان : **مرۆڤ**

شخَّص الطبيبُ المرض . عيّنه وميّزه ممّا سواه **نەخۆشییەکەی دەستنیشان کرد**

شخص بصره، فتح عينيه دون ان يُطبق جفنيه متآملا أومُنزعجاً : **چاوی زەق کرد، چاوی تەبڵەق بوو**

شخُص ضخُم وعظمُ جسمُهُ : **گەورە بوو ، قەبە بوو**

شخْصيّةٌ خصائص جسميّة وعقليّة وعاطفيّة تميّز الشّخص من غيره : **کەسایەتیی**

شَخيرٌ صوت من الحلق او الأنف يصدره الإنسان عند نومه : **پرخە پرخ**

شدَّ عضَدَه . قوّاه . أعانه : **بەهێزی کرد ، یارمەتیدا**

شدَّ وعلى العدوّ . هجم عليه : **هێرشی کردە سەر دوژمن**

شدَّ العقدةَ . او ثقها : **گرێیەکەی توند کرد**

شدا تغنّى و ترنّم : **گۆرانی وت ، گۆرانی چڕی**

شدّةٌ (ج شددٌ) امرٌ يصعبُ تحمله : **کارێکی سەخت لەتوانادا نەبێ**

شدْقٌ (ج اشداق وشدُوق) زاوية الفم ممّا تحت الخديْن : **لێواری دەم بە لای ڕوومەت**

شدق الوادي . جانبهٔ : **لای شیو ، لای چەم ، لای دۆڵ**

شديدٌ ( ج أشدّاء وشداد وشُدود) قويٌّ . رفيعٌ :**بەهێز، بەرز**

شذّ إنفرد عن الجماعة أو خالفهم : **بەتەنها خۆی رای وەهابووە**

شذ الكلامُ : خرج عن القاعدة وخالف القياس : **وتەیەکی شازو جیاوازو بەدەر**
**لە رێسای قسە**

شذا قوّة الرائحة . أذى . ملحٌ : **بۆنی بەهێز ، نەشکەنجە ، خوێ**

شذّب الشجر . قلمهُ . الشيء قطعهُ : **لق و پۆپی برِین ، برِی**

شذرٌ (شذور) قطعٌ من الذّهب : **پارچەیەك لە زێر**

شرٌّ (ج شرورٌ) اذى وفساد : **ئەزیەت و ئازارو خراپەکاری**

شراء (ج أشرية) إبتياع . اشتراء : **کرِین وسەندن**

شرابٌ (ج أشربة) كلُّ سائل يُشرب : **خواردنەوە**

شراسةُ سُوء خُلق : **درِندەیی ، بێ بەزەیی ، بەدرەوشتیی**

شراعٌ (ج أشرعة و شُرُع) من السفينة . قطعة من القماش واسعة تُرفع فوق خشبة . فتنفخ فيها الرّيحُ فتدفع السفينة : **چارۆگەی کەشتی**

شراهةٌ شدّة حِرص على الطعام : **چڵێسی ، نەوسن**

شراهة أكلٌ فوق الحاجة : **نەوسنی ، زۆر خۆر**

شرب الكلام . فهمه : **تێیگەیی ، حاڵی بوو**

شربَةٌ ارضٌ مُعشبةٌ لا شجر فيها : **زەوی بەگژو گیای بێ درەخت**

شرْبينٌ شجرٌ كاسرٌ و ذو خشب أحمر جيّد يُستخرج منه القطرانُ : **داری ئۆرز ، دارێکە باشترین جۆری قەترانی لێدەر دەهێنرێ**

شرج الشيء . جمعهُ : **کۆی کردەوە**

الشّراب بالماء . مزجهُ : **تێکەڵی کرد**

شرْجَ (ج شراج وشروج) نوع . فرقة : **جۆر، دەستە**

شرح الكلام . وضحهُ وفسّره : **ڕوونی کردەوەو ڕاڤەی کرد**

شرح الشيء . وسّعه وبسطهُ : **فراوانی کردو ڕای خست**

شرّح اللحم . قطعه قطعا طوالا رقاقا : **کوت کوتی کرد ، توێ توێ گۆشتەکەی ورد کرد**

شرْخ (ج شروخ) أوّل الشباب و ريعانهُ ، أصلٌ : **تافی لاوی، بنەچە ، سەرەتای گەنجی**

شرخ شقّ . وصدعَ : **قلیش و درز**

شرد نفد واستعصى : **ڕایکرد**

شرد عن الطريق . حاد : **بەڕاگەندە بوو**

شرس ساء خُلقهُ : **بەد ڕەوشت بوو**

شرْشفٌ (ج شراشف) قطعة من قماشٍ تبسط فوق الفراش لتقيه من الاوساخ : **چەرچەف**

شرِط وقع في امرٍ شديدٍ صعب : **کەوتە ناوباری قورس و گران**

شرطٌ (ج أشراط) علامة.إشارة : **هێما، نیشانە**

شرعٌ سواءٌ ، مُتساوون : **وەك یەك**

شرع بدأ : **دەستی پێ کرد**

شرع شرْعا . سنّ : **دەستورو یاسای دانا**

شرعةٌ (ج اشراع) سفينةٌ : **کەشتی**

شرْعيٌ قانونيّ : **یاسایی**



شرفٌ (ج أشراف) علُوٌ ومجدٌ وعزّةٌ : **بەرزی و شکۆمەندی و شانازی**

شرُف صار ذا شرفٍ ومجدٍ : **بەرزبوو و شکۆمەند بوو**

**شَرَّف** الحائط ، جعل له شُرفة ؛ **هەیوانی بۆ کرد**

**شُرْفَةٌ** (ج شُرف) أعلى الشَيء : **لوتکە ، بانی هەر شتێك ، بانیژە**

**شرفة** ما يُقامُ في أعلى البناء ليُملى به ؛ **سەکۆ ، بانیژە**

**شَرَقَ** الشَاة ، شقَ أذنها طولا : **گوێ ی بەدرێژی شەق کرد**

**شرقت** الشَمسُ شُروقا ، طلعت : **ڕۆژهەلأت**

**شَرْقٌ** جهةَ شروق الشَمس ؛ **لای ڕۆژهەلأت**

**شَرِقَ** الدَمُ في عينه ، ظهر ؛ **چاوی سوور هەلگەڕا**

**شرق** لونُه ، احمرَ من الخجل ؛ **لە شەرما ڕەنگی سوور هەلگەڕا**

**شِرْكٌ** (ج اشراك) حصَةٌ ، نصيبٌ : **بەش ، پشك**

**شِرْك** أن يَجعل لله شريكً في ملكه : **هاوبەش دانان بۆ خودا**

**شَرَكٌ**(ج شُرُك واشراك)شبكة لصيد الطيور، مصيدةٌ : **تۆڕی ڕاوکردن، داو، تەلە**

**شَرِكَةٌ** مؤسسته تجارية او إقتصادية خاصة اورسميَة يقوم فيها اشخاصٌ بعمل مشترك ؛ **کۆمپانیا**

**شركة** عقد بين اثنين او اكثر للقيام بعمل مُشترك :**گرێبەستی نێوان دوو کەس یان زیاتر ، کاری هاوبەشی**

**شَرْنَقَةٌ** ( ج شرانق) غطاء من خيوط تنسجه دودة القزَ حول نفسها: **شتێکی خڕە کرمی ئاوریشم هەڵی دەچنێ لە دەوری خۆی بۆ پاراستنی سوڕی ژیانی**

**شَرِه** اشتدَ حرصُه على الطعام وميلُه إليه ؛ **زۆر حەزی لە خواردنە ، نەوسن**

**شُروع** بدْء : **دەست پێکردن**

**شرى** الشيء ، **ملكه بدفع ثمنه : کڕی**

**شِرْيانوشريان** (ج شرايين) عرقٌ نابضٌ يسري منه الدَمُ ؛ **خوێن بەر**

**شريبٌ** مُشارِكٌ في الشُرب : **ئەوەی هاوبەشیت دەکا لە خواردنەوەدا**

**شَرِيحَةٌ** (ج شرائح) قطعة مرقَّقة من اللحم : **پارچە گۆشتێکی تەنك**

**بشَرِيدٌ** (ج شرائد) طريدٌ لا مأوى له : **هەڵاتوو ، دەربەدەر**

**شِرِّيروشِرِّير** ، كثير الشرّ : **شەڕانگێز**

**شَرِيطَةٌ** (ج شرائط) عصابةٌ من قماش ضيِّقة تُعقد على الشَّعر وتُربط بها الثّياب : **قردێلە**

**شَرِيعَةٌ** (ج شرائع) ما شرع الله لعباده من السُّنن والأحكام : **شەرعی خودا**

**شَرِيفٌ** (ج شُرفاء وأشراف) نبيل : **پایەبەرز ، جوامێر**

**شَرِيكٌ** (ج شُركاء) مُشارك في شركة أو عمل : **هاوبەش**

**شَطٌّ** (ج شُطوط وشُطآن) شاطئ النهر او البحر : **کەناری دەریاو ڕووبار ، لێوار**

**شَطْبٌ** (ج شُطوب) طويلٌ ، حسنُ الخلْق : **باڵا ڕێکی ، ڕەوشت جوان**

**شَطْرٌ** (ج أشْطُر وشُطور) نصفُ الشَّيء . جزءُ الشيء : **نیوەی شتێك ، بەشێك**



**شَطَرَ** إتّصف بالدَّهاء والخباثة: **فێڵباز بوو**

**شَطَرَ** الشيء،جعلهُ نصفين: **کردی بەدووبەشەوە**

**شَطْرَنْجٌ** (ج شطرنجات) لعبة من أصل فارسيّ : **شەترەنج**

**شَطَطٌ** مجاوزة الحدّ : **زیادەڕەوی کردن**

**شَطَفَ** الثوب أو نحوه . غسله : **شۆردی ، لە ناوی هەڵکێشا**

**شَطِيرَةٌ** خُبزة تُشقُّ ويوضعُ فيها الإدام : **بابۆڵە ، پاروو ، لەففە**

**شَظِفَ** الشجرُ. صلُب، العيشُ ضاق واشتّد : **ڕەق بوو ، ژیانی سەختوگران بوو**

**شَظِيٌّ** عظمُ صغير مُستدقٌ لازقٌ بالرُّكبة أو بالذّراع : **ئێسکێکی بچووکە لە ئەژنۆ و باڵدایە**

**شَظِيَّةٌ** (ج شظايا و شظيّ) قطعة متناثرة من قنبلة أو قذيفة حين تنفجر : **ساچمە**

شعارٌ شجرٌ مُلتفٌ في مُنخفضٍ من الارض : **شوێنێکی نزمی زەوی دارو درەختی زۆر بێت**

شعاعٌ ظلٌ غير كثيف : **سێبەرێکی تەنك**

شعاع مُتفرّقٌ من كلّ شيءٍ : **ئەوەی بە هەر شتێك جیادەبێتەوە**

شعب الشّيء ، فرّقهُ . الرّجل مات : **جیای کردەوە ، مرد**

شعْبٌ (ج شُعوب) جيلٌ من الناس : **جینێك لە خەڵك ، میللەت**

شعِث الشّعر ، كان مُغبرا مُتلبّدا : **پرچی تۆزاوی بوو**

شعّث الشّيء ، فرّقه : **جیای کردەوە**

شعث من الطّعام ، اكل منه قليلا : **کەمێکی لێ خوارد**

شعْرٌ (ج اشْعار وشعار وشعور) ما ينبت على جسم الإنسان وغيره من الثّدييات وليس بصُوف ولاوبر : **موو**

شعر الرّجلُ ، قال الشّعر : **هۆنراوەی وت ، شیعری وت**

شعِر كثُر شعْرُهُ وطال : **قژی زۆرو درێژ بوو**

شعْشع الضوءُ ، إنتشر خفيفا : **تیشکەکە بە هێواشی بلاوبۆوە**

شعل وشعّل النّار ، اوْقدها : **دایگیرساند**

شُعْلَةٌ (ج شُعل) لهبُ النّار : **کڵپەی ئاگر**

شعْوذةٌ خفّة في اليد أعمال السحْر . احتيال : **جادووگەری، فێڵ کردن ، یاری سیحر بازی ، تەڵەکەبازی**

شعُورٌ إدراك : **درك کردن**

شعور احساس : **هەست کردن**



شعور جنسٌ من الاسماك : **جۆرە ماسیەکە**

شعيرٌ نبات عُشبيٌ يُتّخذ حبّه غلفا للدوابّ : **جۆ**

شغب القومَ وعليهم ـ هيّج الشرّ بينهم : **شەڕو ئاژاوەی لەنێوانیاندا بەرپاکرد**

شغر المنصبُ ، خلا من صاحبه : **پۆستەکە بەتاڵ بوو**

شغف به ، أحبّه حبا شديدا : **زۆر خۆشی دەوێ**

شغفٌ أقصى الحبّ : **ئەو پەڕی خۆشەویستی**

شُغل عنه بكذا ، تلهّى عنه : **سەرقاڵ بوو بەکارێکی تر**

شُغْلٌ (ج أشْغال وشُغُول) إمتلاء الوقت بالعمل او غيره : **سەرقاڵی**

شفٌّ شيء قليل : **شتێکی کەم**

شفا (ج أشْفاء) حرفُ الشيء : **لێواری هەر شتێك**

شفاءُ (ج اشْفية) ذهاب المرض : **چاك بوونەوە**

شفّافٌ مالا يحُجُب ما وراءهُ : **ڕوون**



شفةٌ (ج شفاه وشفهات) ما يُطبق على فم الانسان : **لێو**

شفَر المالُ ، قلّ وذهب : **کەمی کردو نەما**

شفْرةٌ(ج شفار وشفر)سكّينٌ عريضٌ : **چەقۆیەکی پان و بەرین ، کەتەر**

شفرة حدّ السيف : **قەراغی شمشێر**

شفْعٌ زوجٌ من العدد : **جووتە**

شفع بات يرى الشخص شخصين لضعف بصره : **لەبەر کەم بینی یەکێکی بە دووان بینی**

شفّف رقّق : **تەنکی کرد**

شفّفهُ المرضُ ، أوهنهُ : **نەخۆشی هێزی پێ بڕی ، لاوازی کرد**

شفقٌ حمرة في الأفق عند غروب الشمس : **زەردەپەڕ**

شفق أوّل الليل : **سەرەتای شەو**

شفق عليه . رافَ به وعطف عليه : **بەزەیی پیاهاتەوە**

شَفَقَةٌ عطفٌ وحنانٌ : **سۆزو بەزەیی**

شفقة خوْفٌ من حلول مكروه : **ترس و بیم لەخراپە ، ترس لە هاتنی ناخۆشی ، پەرێشان**

شفوقٌ ذو شفقة ورحمة : **خاوەن سۆزو بەزەیی**

شَفى الله المريض . أبرأهُ : **خودا چاکی کردەوە ، خودا شیفای دا**

شُفي المريضُ . برىء وذهب مرضه : **چاك بووەوە نەخۆشییەکەی نەما**

شفيرٌ (ج أشفار) ناحية كلّ شيء وطرفه : **قەراخ و لێواری هەر شتێك**

شَفيعٌ (ج شفعاء) مُعين : **پارمەتیدەر ، تکاکار**

شَفيفٌ (ج شفافٌ) شفافٌ . رقيقٌ : **زۆر ڕوون ، تەنك**

شَقٌّ (ج شُقوق) صدْعٌ وخرْقٌ . مشقة : **قلێش سەختی و دژواری ، ناخۆشی**

شَقَّ عليه الأمرُ ، صعُبَ : **کارەکە سەخت بوو**

شقٌّ (ج شُقوقٌ) نصفُ كلّ شيء : **نیوەی هەر شتێك ، ناوەڕاستی هەر شتێك**

شق جزء : **بەشێك**

شق جانبٌ . ناحية : **لاتەنیشت ، لا**

شقُّ النهر . حفر مجراه : **جۆگەی لێدا**

شقاءٌ ضيقٌ : **تەنگەبەری ، ژیانی چەرمەسەری**

شقاقٌ خلاف : **ناکۆکی**

شقاق فرقة : **جیاوازی**

شُقاقٌ تشقق الجلد من داء او برْد : **پێست قلێشان لەبەر نەخۆشی و سەرما ، قەڵشتن**

شقاوة شقاء : **بەدبەختی**

شُقَّةٌ(ج شُقَق وشِقاق)مسكن واحد في عمارة أو بناية كبيرة : لایەك لە باڵەخانەیەك خانەوادەیەك تیایدا جێنشین دەبن

شُقَّة بُعْدٌ :دووری

شُقْرَةٌ لون بين الذهبيّ والأحمر : ڕەنگێکە لە سورو زەرد پێکدێت

شَقِيٌّ (ج أشقياء) تَعِسٌ : بەهیلاك چوو

شَقِيقٌ (ج أشقّاء) أخٌ من الأب والأمّ ، نصف الشيء، نظيرٌ ، مثيلٌ : (برا) برای دایك و باوك ، کەرتێك ، نیوە ، هاوتا ، وەکو یەك

شَقِيقَةٌ (ج شَقائق) أختٌ من الأب والأمّ : (خوشك) خوشکی دایك و باوك

شقيقة ألمٌ يُصيب نصف الرأس والوجه : ژانی نیوە سەر، شەقەسەر، میگرەین

شَكٌّ رَيْبٌ : گومان

شَكَّ التبس عليه الأمرُ واختلط : لێی تێکەڵ بوو

شكّ ظنَّ : گومانی کرد

شَكَرَ الرَّجلَ . أثنى عليه كما أولاهُ المعروف : سوپاسی کرد

شَكُرَ صار كريماً بعد بُخل : دوای ڕەزیلی بەخشندە بوو

شَكْلٌ دلال المرأة وغنجها: نازی ژنانە

شَكْلٌ (ج أشكول) صورة الشيء : وێنەی هەر شتێك

شكل هيئة ، مثل : شێواز ، شێوە ، وێنە

شَكُورٌ (ج شُكُر)من أسماء الله الحُسْنى : سوپاسگوزار،ناوێکی جوانی پەروەردگارە

شكور مَنْ تبدو عليه آثار النِّعمة : ئەوەی نازو نیعمەتی پێوە دیارە

شَكْوى (ج شكاوى) ما يُشْتكى فيه : سکاڵا

شَكِيمَةٌ (ج شكائم وشُكُم) قوّة القلب :هێزی دڵ

شكيمة طَبْعٌ . أَنَفَةٌ وإباءٌ : سروشتی،سەرکەش ،



**لووتبەرزی**

شلّ الشيء . قطعه : **بڕی**

شلّتْ يدُهُ . يبستْ : **گۆج بوو**

شلاّلٌ ( ج شلاّلات) موضعٌ عال الماء : **تافگە**

شِلّةٌ خصلة مطويّةٌ من خيوط الغزْل: **کلاّفەو دەزوو**

شلِقٌ (ج اشْلاق) نوع من اليَمك : **جۆرە ماسییەکە**

شللٌ مرضٌ يصيبُ الجسم كلّه : **ئیفلیجیی**

شلْوٌ (ج اشْلاء) عضوٌ من الجسد فُصل عنه : **ئەندامێکی لێ بووەوەی جەستە**

شمّ تنشّق رائحة : **بۆنی کرد**

شمٌّ إدراك الرائحة بحاسة الشم : **بۆنکردن**

شماتة فرحٌ بمصيبة الاخرين : **دڵخۆشبەناخۆشی خەڵکانی تر**

شمّاعٌ صانع الشمْع أو بائعه : **مۆم دروستکەر و مۆم فرۆش**

شِمالٌ (ج أشمُلُ وشمائل) يسارٌ : **چەپ**

شمال جهة القلب : **شوێنی دڵ**

شُؤمٌ نحْسٌ : **شووم ، بەد ، بەدێوم**



شمال الجهة المقابلة للجنوب : **باکوور**

شمّامٌ نوع من البطّيخ مخطط بخضرة وصُفرة : **شەمامە، کاڵەکی سەوزو زەرد**

شمبانزي قردٌ من قرود افريقيا يألف الناس سُهولة:**جۆرەمەیمونێکی ئەفریقیە**

شمت فرح بمصيبة الاخرين : **دڵخۆش بوو بە نەهەمەتی خەڵکی**

شمخ الجبلُ . علا وارتفع : **بەرزبۆوە**

شمر مرّ مسرعاً أو مختالا : **خێرا تێپەڕی ، بە خۆ هەڵکێشان ڕۆیی**

شمر الشيء قلّصهُ وضمّ بعضه إلى بعض: **هێنایەوە یەك**

شمْسٌ نجمٌ مُضئ تدورُ حوله الارض وسائر كواكب المجموعة الشمسيه ؛
**خۆر ، رۆژ ، هەموو هەسارەكانی كۆمەڵەی خۆر بەدەوری دا دەخولێنەوە**



شمس امتنع وأبى : **ڕێگری كرد**
شمس لهُ تنكر وأبْدى له العداوة **شەڕی پێ فرۆش**
شمْسيّةٌ مظلّة يُتقى بها المطر والشمس:**چەترسەیوان**
شمّع الشيء،غمسه في الشّمْع المُذاب : **مۆمی تواوەی كرد بەسەریا ، خستیە ناو مۆمی تواوە**
شمْعةٌ واحدةُ شمْع : **مۆمێك**
شمْعدانٌ (ج شماعد و شمْعدانات) منارة من معدن أو بلُور او خزف يُركز عليها الشمْع : **مۆمدان**



شملٌ ما اجتمع من الأمر : **هەمووی گرتەوە ، گشتگیر**
شمْلةٌ (ج شملات وشمال) ثوب يُشتمل به ويُدار على الجسد : **بەرگی فراوان بۆ خۆ پێچانەوە**
شممٌ ارتفاع ، **بەرزی**
شمم : قُربٌ : **نزیكی**
شمنْدرٌ نبات يُؤكل ويُتّخذ منه السُكّر : **چەوەندەر**
شنّ الغارة عليهم . وجّهها عليهم من كلّ جهة : **لە هەموو لایەكەوە هەڵمەتی كردە سەریان**



شناعةٌ قبحٌ : **ناشرینیی**
شنج الجلدُ . تقلص : **هاتەوەیەك**
شنج تقبض : **گرژبوو**
شنُع الشيءُ . قبُح : **ناشرین بوو**

**شَنَفَ** اعرض عنه مترفعا : **بەفیزەوە ڕووی لێ وەرگێڕا**

**شَنَقَ** :**خنکاندی ، هەڵیواسی**

**شنیعٌ** ( ج شُنُع وشنانع) قبیح : **ناشیرین**

**شهابٌ** لبنٌ مُزج بالماء فخفّ بیاضه : **خشتی قوڕ ، خشتی سوور**

**شهِدَ** أدّى ما عنده من شهادة : **شایەدی خۆی دا**

**شهِدَ** المجلس . حضرهُ : **ئامادەی دانیشتن بوو**

**شهد** بالله حلف : **سوێندی بەخواخوارد**

**شهد** الحادث عاینهُ : **بەچاوی خۆی بینی**

**شَهَّرَ** به . اذاع عنه السوء : **خراپەی لەسەر بڵاوکردەوە**

**شَهَرَ** اعلن . نشر : **ڕایگەیاند ، بڵاویکردەوە**

**شُهْرَةٌ** ظهور الشيء وانتشاره : **ناوبانگیی**

**شهرة فضیحةٌ : ڕیسوایی**

**شَهَقَ** الجبلُ أو البناءُ ، ارتفع كثيراً : **زۆر بەرز بۆوە**

**شَهُمَ** صار شهما : **مەردبوو**

**شَهْمٌ** (ج شهام وشهوم) سيّدٌ سديدُ الرأي : **خانەدان ، قسە ڕۆیشتوو**

**شهم** ذكيٌّ نافذُ الحكم : **زیرەك بڕیارەکانی جێ بەجێ بکرێت**

**شهْوَةٌ** رغبة النّفس رغبة شديدة في ما تحبه وتريده:**ئارەزوو وپەرۆش بوون بۆی**

**شهيٌّ** لذيذُ الطعم : **بەتام**

**شهيدٌ** (ج شهداء وأشهاد) من يُقتل في سبيل الله : **شەهید ، گیان بەخشیو لە پێناوی خودا**

**شهيرٌ** معروف بين الناس : **ناودارو ناسراو**

**شهيقٌ** تردّد البُكاء في الصدر : **گریانی ناخ ، هەناسە وەرگرتن**

شِوَاءٌ مَنْ حرفتُهُ الشِّواء : **برژێنەری گۆشت**

شَوائِبُ عيوب : **خلتە ، کەم و کورییەکان**

شَوارِبُ ما ينبت منْ شعر على شفة الرجُل العُليا : **سمێڵ**



شَوَّحَ الشَّيءَ ، انكرَهُ : **نکوڵی کرد**

شَوْرَبة حساء : **شۆربا**

شُورى تشاوُرٌ : **ڕاوێژکاری**

شَوَّشَ الأمر ، خلطَهُ وجعله غير مرتَّب : **تێکیدا**

شَوَطَ اللحم ، انضجه : **کوڵاندی**

شَوْقٌ (ج اشواق) ميل النَّفس إلى الشيء وتعلُّقها به : **حەزکردن**

شَوْكٌ (ج اشواك) ما يخرج من النَّبات شبيهاً بالإبر : **دڕك**

شَوكَةٌ إبرة العقرب ، قُوَّة وبأسٌ : **چزوی دووپشك ، هێزو توانا**

شَوهَ الوجهُ ، قَبُحَ : **ناشرین بوو**

شَوىً أمرٌ هيِّنٌ حقير : **کاری سووك و چرووك**

شَوى أطراف الجسْم : **پەل مرۆڤ**

شِوِيٌّ ماشُوِيَ من اللحم : **گۆشتی برژاو**

شَيءٌ (ج أشياء) ماكان جامداً لا حراك به : **تەنی بێ گیان ، شت**

شَيء ما يصحُّ ان يُعلَم ويُخبر عنه : **ئەوەی دەگونجێت باسبکرێ**

شَيْبٌ بياض الشَّعر : **سەر سپی ، سپی بوونی مووی سەر**

شَيْخٌ (ج شُيوخ وأشْياخ) من بلغ سنَّ الشيخوخة : **پیر**

شَيخ رجل ذُو مكانةٍ من علم أو فضْل : **زانا ، قسەڕۆیشتوو**

شَيَّدَ البناء ، بناهُ ورفعه : **دروستی کردو بەرزی کردەوە**

شيدٌ ما طُلي به البناءُ من جصٍ ونحوه : **ئەوەی دیواری پێ سواخ و ڕووپۆش دەکرێت لە گەچ و چیمەنتۆو هی تر ...**

شيطان (ج شياطين) روح متمردة شريرة : **ئەهریمەن ، شەیتان**

شَيْطنَ فعل فِعْل الشيطان : **کاری ئەهریمەنانەی ئەنجامدا ، شەیتانی کرد**

شَيْءٌ (ج أشياء) مقدار : **ئەندازەیەك**

شيعةٌ (ج شيع وأشْياع) **فرقةٌ من المسلمين ناصر والأمام (عِليّ بن أبي طالب)** واله : **دەستەیەك موسڵمانان پشتیوانیان لە ئیمامی عەلی کرد**



شيعيٌّ واحدُ الشّيعة : **شیعەیەك ، کەسێکی شیعە**

شيقٌ أعلى الجبل : **لوتکەی چیا**

شيق جانبٌ : **لایەکی شاخ**

شيمةٌ (ج شيم) طبيعة وخُلقٌ : **سروشت و ڕەوشت**

شُيُوعيٌّ منتسب إلى مذهب الشُّيُوعيّة : **کۆمۆنیستی**

الشيوعية مذهبٌ يقومُ على إشاعة الملكيةِ مُناصرة العُمّال والطبقات الكادحة: **ڕێبازێکە بۆ سەر خستنی چینی کرێکاران و زەحمەتکێشان کار دەکا**




## بابُ الصاد ، بەشی پیتی (صاد)

ص الحرف الرابع عشر من حروف الهجاء : **پیتی چواردەهەمە لە ڕیزبەندی پیتە هیجائییەکان**

صائبٌ (ج صياب) مَن كان على على صواب : **ئەوەی لەسەر ڕێگەی ڕاستە**

صائحٌ مُنادِ ، مُصوِّتٌ بشدَةٍ : **بانگدەر ، هاوار کەر**

صائغٌ (ج صاغَة وصَوَّغ وصُيَّاغ) مَن يصنع الحلى من الذَّهب والفضَة : **زەڕەنگەر ، ئاڵتوون فرۆش**

صائمٌ(ج صُوَّام)ممتنِع عن الطَعام والشَراب من طلوع الفجْر إلى غروب الشَمس مع النيَة : **ڕۆژووگر ، ڕۆژووەوان**



صابرٌ متجلِّد يواجه المصائب والبلايا بعزم وجرأة : **ئارامگر**

صابرٌ غالبه في الصَبْر : **ئارامی گرت**

صابونٌ مركَب من الزيت والقلى يُنظَف به و يُغسل : **سابون**

صاتَ أحدث صوتاً . صاح : **دەنگی دەرهێنا ، هاواری کرد**

صاجٌ طبقٌ من معدن محدّب يُخبز عليه : ساج ، سێله



صاحَ صَوّت بشدّةٍ : هاواری کرد

صاحبٌ (ج واصحاب وصَحْبة) مُرافق : یاوەر

صاحب ملازم ، مُعاشر : یاوەر ، هاوڕێ

صاخِبٌ شديدُ الصّياح : دەمبەهاوار

صادَ الصيدَ ، امْسكهُ بالمصيدة : ڕاویکرد

صادٌ (ج صيدان واصْياد) نحاس اصفر : مسی زەرد

صادِحٌ صائحٌ، رافعٌ صوته بالغناء : هاوار کەر ، مرۆڤی دەنگ بەرز ، گۆرانی بێژی دەنگ بەرز

صادِراتٌ مايُرسل من بضاعة بلدٍ الى الخارج : ناردەنی

صادفَ قابله من غير قصد أو موعد : بەرێکەوت بینی



صادِقٌ مُخْلصٌ : دڵسۆز، ڕاستگۆ

صادق مُخبرٌ بالواقع : ڕاستگۆ

صادَمَ دافعه : پیای کێشا

صادم ضربه : لێیدا

صار صوّت : دەنگی لێوە هات

صار الأمرَ . تحوّل من حال إلى حال : گۆڕا

صار وصل : گەیشت

صار من أخوات (كان) : بوو

صارِخٌ ديك : کەڵەشێر

صارخ مستغيث : ئەوەی داوای فریاکەوتن دەکا

صارخ صائحٌ : هاوار کەر

صارمٌ (ج صوارم) سيفٌ قاطعٌ : **بڕندە ، شمشێری تیژ**

صارم رجلٌ شجاع : **پیاوی ئازا**

صارم ماض في كلّ أمر : **هەر کارێك مەبەستی بێت دەیکات**



صارُوخٌ (ج صواريخ) قذيفةٌ ناريّةٌ أسطوانيّةُ الشكل محروطيّة إلى مسافات بعيدة : **موشەك**

صاروخ مركبة لنقل زواد الفضاء : **کەشتی ئاسمانی**

صاعٌ (ج صيعان واصْوُع واصواع) مكيال : **ڕبە ، پێوانە**

صاعدٌ مُرْتقٍ سائرٌ إلى أعلى : **هەڵکشاو ، سەرکەوتوو**

صاعِقةٌ (ج صواعِق) عذاب و هلك : **تەشکەنجەی لەناوبەر ، بروسك**

صاعقة صيحة العذاب : **هاواری ئەشکەنجە**

صاغ الشيء ، سبكه ، أذابه وصبّه في قالب : **داڕشت ، لە قاڵبی دا**

صافَ الكَبْشُ ، كثُر صوفه : **خوریيەکەی زۆربوو**

صافَّ القومُ في المعركة ، وقفوا مُصْطَفين : **یەك ڕیز وەستان**

صافِرْلصٌّ ، كلُّ مالا يصيدُ من الطّيْر : **دز ، ئەو باڵندانەی ڕاو ناکرێن**

صافى اخلص له المودّة : **پاك و پوختی کرد**

صال عليه ، سطا عليه وقهره : **چووە سەری و پەلاماریدا**

صالّةٌ، داهية ، مصيبة : **بەلا، کارەسات**

صالة ، قاعة : **هۆڵ**

صالح (ج صُلحاء وصُلاّح) مستقيم خيّر جديرٌ بـ : **پیاو چاك ، لەبار**

صام عن الأمر ، إمتنع عنه ، أمسك عن الطعام والشراب في أوقات معلومة : **خۆی لێ گرتەوە ، وازی لە خواردن و خواردنەوە هێنا ، بەڕۆژوو بوو**

صامِتٌ (ج صُمُوت وصوامت) ساكت ، لبنٌ خاثرٌ : **بێ دەنگ ، شیری بزرکاو**

صانَ الشّرف . حفظه ممّا يعيبه : **شەرەفی خۆی پاراست**

صانعٌ (ج صُنّاع) من كانت الصناعة حرفته . من يصنع بيديه : **پیشەساز ، دروست کەر ، وەستا**

صانع، رشا : **داوی چارەسەری کرد ، بەرتیلیدا**

صاهر القوم . صار لهم صهرا : **بوو بە خزمیان ، بووە زاوایان**

صبّ إليه أحبّه حبّا شديدا واشتاق إليه : **زۆر خۆشی ویستوو و هۆگری بوو**

صِباً صغرٌ . طُفولةٌ . شوقٌ : **بچووکی ، منداڵی ، ئارەزوو**

صبا اليه حنّ . اشتاق : **بیری کرد ، پەرۆش بوو بۆی**

صبأ ترك دينه واعتنق دينا اخر : **لە ئاینی خۆی هەڵگەڕاوەو چووە سەر ئایینێکی تر**



صبابةُ حُبٌّ شديدٌ . رقّة الهوى : **شەیدایی ، حەزلێکردن**

صَباحُ اوّل النّهار : **بەیانی**

صبّار نبات له أوراق عريضةٌ سميكةٌ دائمةُ الخُضرةِ : **هەنجیرەدڕکن‌سەببار**

صبّاغٌ منْ حرفتهُ الصّباغة . كذّابٌ : **بۆیەچی ، درۆزن**

صباغةٌ حرفةُ الصّبّاغ . تلوين الثّياب وغيرها : **بۆیە چێتی ، ئەوەی پیشەی ڕەنگکردنی دیوارو دەرگاو هیتر ...**

صبح القوم . آتاهم صباحا : **بەیانی هاتە لایان**

صبُح الغلامُ . صار جميلا : **جوان بوو**

صبر تجلد ولم يجزع . على الأمر . احتمله : **دانی بەخۆداگرت ، بەرگەی گرت**

ضمن به . كفل به : **بوو بە زامنی**

صبع اشار باصبعه : **بە پەنجە ئاماژەی کرد**

صِبْغَةٌ (ج صبغ) ما يُصبغ به ، مِلّة ، دينٌ : **بۆیە ، گەل ، ئایین**

صَبُورٌ (ج صُبُر) من أسماء الله الحُسنى ، شديدُ الصَّبْر ، حليمٌ : **ناوێکی دوانی پەروەردگارە ، زۆر بە ئارام ، لەسەرخۆ**

صَبِي فعلَ فعْلَ الصَّبيّ : **کردەوەی منداڵانەی کرد**

صَبيحةٌ (ج صباح) صَباح : **بەیانی**

صَبيرٌ (ج صُبراء) صابرٌ ، كفيلٌ : **بەئارام ، زامن**

صَحَّ ذهبَ مرضهُ : **چاك بۆوە**

صَحا النَّائمُ،استيقظ، السَّكْرانُ، ذهبَ سُكره : **بە ئاگاهات،بەهۆشی خۆی هاتەوە**

صَحَت السماءُ ، زالَ غيمُها : **هەورەکان ڕەوینەوە**

صَحابةٌ أصحاب البنيّ محمّد(ﷺ) الذين لقوة وطالتْ صُحبتهم معه : **هاوەڵ و یارانی پێغەمبەر(موحەممەد) (ﷺ)کە لەگەڵیدا دانیشتوون**



صِحافةٌ مهنتهُ مَن يجْمعُ الأخبارَ والاراء ونشرها في صحيفة او مجلّة : **ڕۆژنامەگەری**

صحَافِيٌّ عاملٌ في الصَّحافة : **ڕۆژنامەنووس**

صَحَبَ الحيوان المذبوح ، سلخه : **کەوڵی کرد**

صِحَّةٌ سلامةٌ من الامراض : **تەندروست**

صحَّح الكتاب أزال خطأهُ : **هەڵەو ناتەواویەکانی ڕاست کردەوە**

صَحْراءُ (ج صحارى وصَحار وصحاريّ) بيْداء : **بیابان**

صَحْنٌ(ج صُحون) قطعة الطّعام ، مدحٌ كبير : **قاپ ، لەگەن**

صَحْنُ الدّار ، وسطها أوساحتها : **حەوشە**

صِحّيٌّ ما يناسب الصحّة ويحفظ سلامتها : **تەندروست**

**صحيحٌ** (ج اصحاء وصحاح) سالم من المرض او العيب او الشك . مطابق للواقع : **لەشساغ و بێ کەم و کوڕی و بێ گومان ، ڕاستی و دروست**

**صحيفةٌ** (ج صَحائف و صُحُف) ورقٌ مكتوب : **پەڕەی نوسراو**

**صخَابٌ** كثير الصَّخَب شديدُه : **زۆر بەقیژە**

**صخِب** صاح وضجَّ : **هاواری کرد ، قیژاندی**

**صخْرة** (ج صخور وصخر وصخرا) حجر كبير صُلبٌ : **تاشە بەرد**

**صدَّ** هجران . جانَبَ : **بەجێ هێشتن ، لا**

**صدَّ** عنه اعرض وحال : **ڕووی لێ وەرگێڕا**



**صدا** بيديه . صفق : **چەپڵەیلێدا**

**صدارةٌ** تقدُّم : **پێشکەوتن**

**صُداعٌ** الم الرأس عموما : **ژانە سە، سەر یەشە**

**صداقة** محبةٌ بصدق رفاقه : **خۆشەویستی ڕاستەقینە، هاورێیەتی، برادەرایەتی**

**صدامٌ** شجار تضارُبٌ : **بەگژیەکدا چوون ، پێکدادان ، شەڕ**

**صدح** الرّجلُ او الطائرُ . رمح صوته بغناء : **گۆرانی وت ، جریوانی**

**صدر** عن المكان . رجع عنه . الى المكان . صار اليه : **لێی گەڕایەوە ، بۆی چوو**

**صدرٌ** (ج صدور) مادون العنق الى البطن . مقدم كل الشيء : **سینگ ، پێشەوەی هەموو شتێك**

**صدَّر** اجلسه في صدر المجلس : **لەسەرەوەی مەجلیس دایناو**

**صدع** الشيء . شقه ولم يفترق : **شەقی کردو لێکی نەکردەوە**



صدْعٌ جماعة من الناس : **كۆمەڵە خەڵكێك**

صدُعَ الرّجلُ ضعُف : **لاواز بوو**

صدَف انْصرف : **لايدا**

صدَق في الحديث ، أورده على حقيقته من غير كذب:**ڕاستی وت**

صِدْقٌ مطابقة الحقيقة و الواقع : **ڕاستی**

صَدْقٌ الكامل من كلّ شيء : **هەموو شتێكی تەواو**

صَدَقةٌ (ج صدقات) ما يُعطى تقرّبا إلى الله : **بەخشین**

صَدْمةٌ دفْعة ، ضرْبة : **پیاكێشان ، بەركەوتن**

صدّهُ عن كذا ، منعهُ : **ڕێگەی لێگرت**

صَدُوقٌ (ج صُدُق وصُدُق) دائم الصّدْق : **هەمیشە ڕاستگۆ**

صَدىً رجْعُ الصّوت ، دماغ : **دەنگدانەوە ، مێشك**

صَدِئَ الحديدُ ، غطّاه الصّدأ : **ژەنگ دایپۆشی ، ژەنگ لێ یدا**

صِدّيقٌ كثيرُ الصّدْق : **زۆر ڕاستگۆ**

صَديقٌ (ج اصْدقاء وصُدقاء) صاحبٌ وفيٌّ : **هاوڕێی بە وەفا**

صِرٌّ شدّة البرد ، شدّة الصّوت : **سەرماو سۆڵەی توند ، دەنگی بەهێز**

صَراحَةٌ وضوحٌ و خلوصٌ من الالتواء و الكذب : **بە ڕاشكاوی**

صِراطٌ طريق : **ڕێگە**

صِراعٌ مصارعة نزاع : **زۆرانبازی ، ناكۆكی شەڕ**

صَرّافٌ من يبدل النقود بنقودٍ من نوع آخر : **پارەگۆڕ**

صِرافَةٌ حرفة الصّراف : **پیشەی پارە گۆڕینەوە**

صُرّةٌ (ج صُرر) ما تُجمع فيه الدّراهم او غيرها وتُربط : **كیسەی پارە**

صَرْحٌ ( ج صُروح) قصرٌ . كلّ بناء عال : **كۆشك ، هەموو ، باڵەخانەی بەرز**

صرح الأمر . أظهرهُ واوضحهَ : **ئاشکرای کرد ، ڕوونی کردەوە**

صرُح خلص وصفاتُها بعيبه : **لە هەموو کەم و کوڕییەك پاك بۆوە**

صرخ صاح صياحا شديداً ، إستغاث : **هاواری کرد ، داوای فریاکەوتنی کرد**

صرخةٌ صيحةٌ : **هاوارکردن**

صرْصرٌ (ج صراصر) حشرة قفازة تصيح صياحا رقيقا خاصة في أثناء الليل : **سیسرك ، زیندەوەرێکە بە شەو دەنگی لێوە دێت**



صُرع اصابه داء الصّرع : **تووشی پەر کەم بوو ، تووشی فێ بوو**

صرْعٌ (ج صروع) مثلٌ ، علّة في الجهاز العصبي تصحبها غيبوبةٌ وتشنج في العضلات : **فێ ، پەرکەمنەخۆشییەکی کۆ ئەندامی دەمارە**

صِرْفٌ خالص صافٍ من العيب والكدر : **پاك و بێگەردە لە ناتەواوی و لیڵی**

صرْفٌ علمٌ في اللغة يبحث في صيغ الكلمة : **زانستی وشەسازی**

صُروف الدهر . نوائبهُ : **نارەحەتییەکانی ڕۆژگار**

صرف البابُ او غيرهُ ، صوتَ عند فتحه أو إغلاقه : **جیڕەی لێ وە هات**

صرّف النقود ، بدلها بنقود من نوع أخر : **پارەی گۆڕییەوە**

صرّف الأمر ، دبّره : **تەگبیری کرد**

صرم هجر الشيء ، قطعه : **بەجێی هێشت ، بڕی**

صرُم السيفُ ، صار قاطعا صارما : **تیژو بڕندە بوو**

صريحٌ (ج صُرحاء) مُستغيث ، خالص صافٍ من العيب : **فریاگوزار ، پاك و پوخت لەکەم و کورتی**

صريرٌ صوت القلم عند الكتابة به : **دەنگی پێنوس لەکاتی نووسیندا**

صوت الأسنانحين يحتكّ بعضها ببعض : **جیڕەی ددان**



صوت الباب حين يُفتح او يُغلق : جيرەی دەرگا

صريعٌ (ج صرعى) مصروع : پەرکەمدار

صَعُبَ الأمرُ عَسُرَ واشتدَّ : کارەکە قورس و گران بوو

صَعْتَرٌ نباتٌ طيّبُ الرائحة حَرِيفُ الطعم : جاترە ،گیایەکی بۆن خۆشە لەناو چێشت دەکرێ

صَعَّدَ فيه النَّظر تأمّله ناظراً إلى اعلاه وأسفله : تەماشای کرد لە تەوقی سەر هەتا بنی پێ ی

صعِد علا : بەرز بۆوە

صعَّرَ أمال خدَّه تكبُّراً مُعرضاً عن الناس : بە لە خۆباییەوە ڕووی لەولا کرد

صعرَ ما عنقه او وجه إلى احد الجانبين : ڕووی سوڕاند بۆ لایەك

صعق الرعدُ . اشتدَّصوته . الثورُخار خُواراً شديداً : هەور گرماندی ، گامێشەکە بە توندی قۆڕاندی

صُعْلُوكٌ (ج صعاليك) فقير : هەژار ، نەناسراو

صعيدٌ (ج صُعُد وصعُدات) مرتفعٌ من الأرض ،تراب : تەپۆلکە ، خۆڵ

صغُر صار صغيراً : بچووك بوو

صغيرٌ (ج صغار وصُغَراء) ضد كبير : بچووك

صَفٌّ(ج صُفوف)سطرٌ مستقيم من كلّ شيء،جماعة من التلاميذ في مستوى واحد وغرفة واحدة : هێلی ڕاست لە هەموو شتێکدا، ڕێز ، پۆلی قوتابخانە

صفا صار صافياً نقياً : ڕوون و بێ خەوش بوو

صَفا الجوُّ . لم يكن فيه غيْمٌ : **كەش و هەوا خۆش بوو**



صَفاءٌ وضوحٌ : **ڕوون**

صَفّارَةٌ أداةٌ صغيرة يُنفخ فيها : **شاور ، فيت فيتە**

صِفَةٌ (ج صِفات) نعْتٌ : **هاوەڵناو ، ناوەڵناو**

صَفْحٌ (ج صِفاح) عرْضٌ مفرط في الخدّ : **ڕوومەت ، لایەکی ڕوو**

صَفْحَةٌ من كلّ شيء مع وجهه : **ڕووی هەر شتێك**

صَفَدٌ(ج أصْفاد) عطاء،وثاقٌ : **بەخشین، کەلەپچە**

صَفَرٌ مرضٌ يصفرّ منه الوجه . جوع : **زەرتك ، زەردوویی ، برسێتی**

صَفِرَ البيتُ خلا من ساكنيه : **ماڵەکە چۆڵ بوو**

صِفْرٌ رقم يدلّ على الخلوّ من القيمة العدديّة : **ژمارە سفر**

صَفِرٌ (ج أصْفار) خال : **نوقتە ، نوختە**

صَفْصافٌ شجرٌ ينبت عند مجاري المياه : **دار بی**

صَفْصَفَ العصورُ زقزق : **چۆلەکە جیوە جیوی کرد**

صَفَّفَ الشَعر رتّبه : **قژی داهێنا ، پرچی داهێنا**

صَفَقَ وقح : **چەقاوە سوو بوو**

صَفْقَةٌ عقدُ بيع : **گرێ بەستی کڕین و فرۆشتن**

صَفوحٌ كريم جوادٌ : **بەخشندە**

صفّى الحساب . أنهاه . الشيء . نقّاه ممّا يشوبه : **کۆتایی بە حسابەکە هێنا ، لە هەموو شتێك پاکی کردەوە**

صفيحة (ج صفائح و صفيح) كلّ عريض من حجارة أو معدن أو لوح : **تەنەکە، بلیتی بەردو دارو ئاسن و هیتر**





صفيرٌ كل صوت من الشفتين : **فیکەی بە لێو**

صقرٌ (ج صقور و اصقر) طائر من الجوارح يصاد به : **باز**

صقع الرجلُ . اصابه اذى الصقيع : **لەسەرمان ئازاری پێ گەیشت**

صقل الكلام . هذبه : **قسەکەی ڕێك خست**

صقيعٌ جليد : **سیخوار ، زوقم**

صقيلٌ (ج صقال) لماع : **بەشەوق ، لووس**

صكٌّ (ج صكوك) وثيقة تثبت حقا في ملك : **بەلگەنامە**

صلاةٌ (ج صلوت) دعاءٌ . صلاحٌ احسانٌ . الركن الثاني من اركان الاسلام الخمسة : **نزاوپاڕانەوە ، چاکەکاری ، نوێژ (دووەم ڕوکنی ئیسلام)**

صلّب المسيحيُّ . رسم علامة الصليب على صدره ورأسه بيده : **لەسەر لەشی خۆی کێشای ، بە نیشانەی خاچ**

صلب صار صلبا : **ڕەق بوو**

صُلْبٌ (ج اصلاب واصلب) عظم في الظهر : **پشت**

صلب علقه ممدود الرجلين ممدود اليدين : **بەدارێکا جوار پەلی بەستی و هەڵی واسی**

صلةٌ ، عطيّة . رابطة . إحسان : **خەڵات ، پەیوەندی ، چاکە**

صُلْح سلم بعد حرب : **ئاشتەوایی**

صلُح صار صالحا : **چاکبوو**

صلحتْ حاله . زال منسادها : **حاڵی باش بوو**

صلصالٌ طينٌ يابس يصلصل من شدة يبسه : **قوڕی وشك کراوە**

صلع الرجلُ سقطَ شعر مقدم رأسه او وسطه : **ئەسڵەع بوو ، کەچەڵ بوو**

صلعت الشجرةُ . سقطت رؤوس أغصانها : **درەختەکە ڕووتایەوە**

صُلْعة وصلَعة ، موضعُ الصَلع : شوێنی ڕووتانەوە ، شوێنی کەچەڵیی

صلّى دعا ، اقام الصلاة : پاڕاوە ، نوێژی کرد

صليبٌ (ج صُلْبان وصُلُب) عند المسيحييّن ، كل ماكان على شكل خطيْن المْتقاطِعيْن، خالصُ النَسب صافيه ، قويٌ امين : خاچی دیانەکان ، ڕەچەڵەکی پاك و بێگەرد ، حەق و بەهێز

صَليبيٌّ واحد الصَليبيَة : خاچ ، دروشم

صليبيَةٌ قوم اتوامن( أوروبّا)إلى الشرَق : نەتەوە خاچ پەرستەکانی ئەوروپا کە هاتن بۆ ڕۆژهەلأت

صَليلٌ صوْت وقع الحديد بعضه على بعضٍ : تەقە تەقی ئاسن ، کوتەکوت

صَمٌ ذهب سمعه ، القارورة ، سدُها : کەڕبوو ، سەر قاپەکەی خستە سەر قاپەکە

صِمامٌ (ج اصِمَة) سداد ينفتح تلقائيّاً عند ازدياد الضَغط : ئەو قەپاغانەی بۆ خۆیان دەکرێتەوە دوای زەختی زۆر

صَمَتَ سكت : بێدەنگ بوو

صَمَدٌ (ج اصماد وصِماد) مكانٌ غليظٌ مرتفعٌ : شوێنێکی بڵندو بەرز

صمد ثبت واستمرَ : چەسپاو و بەردەوام بوو

صَمَدٌ من اسماء الله الحُسنى ، سيّدٌ مُطاعٌ صاحبُ امر ، دائم : ناوێکی جوانی پەروەردگارە ، خاوەن فەرمان ، بەردەوام و هەردەم

صمَغ الشيء ، ألصقه بالصَمغ : بە کەتیرە پێوەی نوساند ، سمغی لێ دا

صمغٌ (ج صُمُوغ) مادَةٌ لزجةٌ تُستعملُ في الصاق الأوراق : کەتیرە

صممٌ فقدان حاسَة السَمع : کەڕیی

صمَم مضى في الأمر غير متردِّد ، عزم عليه : کارەکەی بێ دوو دڵی ئەنجامدا ، سوور بوو لەسەر ئەنجامدانی

صميمٌ خالص شِدَة الحرَ او البرد : پوخت ، گەرماو سەرمای سەخت

صنّارةٌ وصِنارةٌ(ج صنانير )حديدة معقوفةيستخدمها صيّاد السّمك ليصطاد : قولابی راوه ماسی

صناعةٌ (ج صنائع وصناعات) عمليّة استخراج الموادّ الأوّليّة : پيشه سازی

صناعيٌّ منسوب إلى صناعة : پيشەگەر

صُنْبورٌ (ج صنابير) ثقب الحوض الذي يخرج منه الماء ، رجل ضعيف ذليل لا اهل له ولا نصير : حەنەفییە ، بەلوعەی حەوز ،بۆری ئاو ،پیاوی بێ خێرو بێر

صَنَّجَ القَوْمَ، رَدَّكلامَهُم إلى اصله: هەر یەكێكی گەڕاندەوە سەربنچینەی خۆی

وصَنَّجَهُ بالعَصا ، ضربه بها : بەگۆچان لێیدا

صَنْدَل (ج صنادل) شجرٌ له رائحة طيبة ، سفينة تُستخدم في الأنهار : دار سەندەڵ ، كەشتی ، پاپۆڕ

صُنْدُوق(ج صناديق)وعاء من خشب او معدن تحفظ فيه الأشياء: باوڵ ، سندوق

صِنْدِيدٌ (ج صناديد) قوي ، شديد : بەهێز، ئازا

صَنَّعَ البلاد ، قوّى صناعتها ونشرها : پيشەسازی ولأتی بەهێز كرد

صنَعَ الشيء ، عمله : دروستی كرد

صَنْعَة عملُ الصانع : پيشه

صَنَّفَ الكتابَ ، ألّفه وجمعه : كتێبی نووسی

صِنْفٌ (ج اصناف وصُنُوف) نوعٌ ، ضَرْبٌ : جۆر ، جەشن

صَنَمٌ ( ج أصْنام) تمثال يُعْبَد من دون الله : بت

صِنْوٌ (ج صنوان واصْنان) مثْل ، شبْه ، نظير : وێنە

صَنَوبَرٌ شجر جبليّ دائم الخضرة : سنەوبەر

صَنيعٌ (ج صنائع) فعْلٌ حسنٌ ، مصنوع : كاری چاك ، دروست كراو

**صَهْ** اسكت : **وس به ، بێ دەنگ به**

**صَهْباء** خمْر : **مەی**

**صِهْرٌ** (ج أصْهار) زوجُ الإبنة أو الأخت : **زاوا**

**صَهَرَ** أذاب ، الشيء : دهنهُ بالشحم المذاب : **تواندییەوە ، چەوری کرد**

**صِهْرِيج** (ج صهاريج) حوضٌ كبيرٌ يُخزّنُ فيه الماء : **بەنداو ، حەوزی ئاو**

**صَهَلَ** الفرس ، صوّت: **حیلاندی**

**صَوابٌ** ضدّ خطأ ، لائقٌ : **ڕاست ، شایستە**

**صَوّانٌ** حجر صلب تُشعل به النار : **بەردە چەرخ**

**صَوْبٌ** جهةٌناحيةٌغيث نافع : **لا ، بارانی بەسوود**

**صَوَّبَ** الخطأ صحّحه : **هەڵەی ڕاست کردەوە**

**صوتٌ**(ج اصوات)ماتلتقطه الأذن من تموّجاتٍ ناشئة من اهتزاز جسم ما:**دەنگ**

**صَوّتَ** أدلى بصوته في عمليّة انتخاب: **دەنگی دا**

**صاح** به ناداهُ : **هاواری کرد، بانگی کرد**

**صَوَّرَ** إلتقط صورة بآلة تصوير : **وێنەی گرت**

**صُورٌ** بوقٌ على شكل قرن يُنْفَخ فيه : **کەڕەنا ، بووق**



**صُورةٌ** (ج صُوَر وصور وصُور)

شكل ، صفةٌ ، تمثال مُجسّم ،

كل ما يُصوَّر : **شێوە ،**

**چۆنییەتی ، پەیکەر، وێنە**

**صُوفٌ** (ج أصْواف) ما يكسو

جسم الشّاة : **خوری**

**صَوْلجان** (ج صولجة) عصا

معقوفة الرأس ، عصا الملك : **گۆپاڵ ، داری دەستی پاشا**

صومٌ إمتناعٌ عن الأكل والشرب في أوقات معيّنة: **ڕۆژوو**



صَومَعَة (ج صوامع) مكانُ عبادة النّاسك ، بيتُ عبادة عند النصارى : **خەڵوەتگە ، شوێنی خواپەرستیی دیانەکان**

صَيّادٌ صائد ، قنّاصٌ : **ڕاوچی ، نیشانە شکێن**

صياغَةٌ حرفة الصائغاشتقاق : **زەرەنگەری ، و شەداهێنان ، نووسینەوە**

صيانَةٌ حفظٌ ووقاية ، إصلاح : **پاراستن و پارێزگاری ، چاککردن**

صيتٌ ذكرٌ حسن منتشر بين الناس : **ناوبانگی باش**

صَيْحَةٌ صُراخٌ ، عذابٌ ، نفخٌ في الصُّور قُبيل يوم الآخرة : **هاوار ، ئەشکەنجە ، فوکردن بە بووق لە ڕۆژی دوایی**

صَيْدٌ ما يُصاد : **نێچیر**

صَيْدَلَةٌ علمٌ يُبْحث في تصنيع الأدوية : **دەرمانسازیی**

صَيْدَلِيَّةٌ دكان الصَّيْدليِّ مهنة الصَّيدلانيِّ : **دەرمانخانە، پیشەی دەرمانسازیی**

صَيْرٌ غاية الأمر ومنتهاهُ ، عاقبة : **دەرەنجامی کۆتایی ، دەرەنجام**

صَيْرَفيٌّ من يُبدلُ العُملة بعُملة اخرى : **پارە گۆڕەرەوە**

صيغَةٌ (ج صيغ) اصلٌ ، هيئةٌ ، نوعٌ : **بنەڕەت ، شێوە ، جۆر**

صَيْفٌ (ج اصياف) فصلٌ من فصول السّنة الأربعة : **وەرزی هاوین**

صَيَّفَ بالمكان ، اقام بهِ صيفاً : **هاوین تیامایەوە**

صينيَّةٌ طبقٌ من قشٍ مضُغور او معدن او خزف تقدم عليه القهوة : **سینی ، خوانچە ، دەفرێکی پانی نان و چێشتی لەسەر دادەنرێ لەکاتی نان خواردندا یا خود بۆ گێڕانی چاو قاوە بەکاردەبرێ**




# بابُ الضاد ، بەشی (ضاد)

ض الحرف الخامس عشر من حروف الهجاء : پیتی پانزەهەمە لە ڕیزبەندی پیتە هیجائییەکان

ضؤُلَ صغُر جسمه ونحُف ، نقَص حجْمُهُ : بوکایەوە و لەشی لاواز بوو ، کێشی لەشی کەم بۆوە

ضئيلٌ (ج ضُؤَلاء وضِئال) نحيف : لاواز

ضاء أنار واشرق : ڕووناکبۆوەو شەوقی دایەوە



ضاءَل صغَّر ، قلَّل : بچوکی کردەوە ، کەمی کردەوە

ضائعٌ (ج ضُيَّع و ضِياع) مفقودٌ ، ضالٌّ : بێ سەرو شوێن ، سەرگەردان

ضائقة أزمة ماديّة او إقتصاديّة : قەیرانی دارایی و ئابوری

ضابطٌ (ج ضُبّاط)مرتبة في الجيش والشرطة : ئەفسەری سوپاو پۆلیس

ضاج الوادي . إتّسع : دۆڵەکە فراوان بوو



ضاج عن كذا ، مال : **لێ ی لادا**

ضاجعَ الإمراة ، استلقى معها : **پیاوەکە لەگەڵ ژنەکەی درێژ بوو ، لەگەڵی جووت بوو**

ضاحكَ ضدَّ باكِ : **پێکەنین**

ضاحكهُ ضحك معه : **لەگەڵی پێکەنی**

ضاحيَةَ (ج ضواحٍ) ناحية ظاهرة خارج المدنية : **دەوروبەری شار**

الضارُّ من أسماء الله الحُسنى : **ناوێکی** جوانی پەروەردگارە

ضارٍ (ج ضوارٍ)حيوانٌ مولعٌ بأكْلِ اللحْمة : درندەی **گۆشت خۆر**

ضارِ جاع كثيرا : **زۆر برسی بوو**

ضارَبَ ضرب كلّ منها الاخر : **لە یەکتریاندا ، شەڕیان کرد**

ضارَبَ في المال . إتّجربه : **بازرگانی بە ماڵەکەوە کرد**

ضارَعهُ شابهه ، ماثلهُ : **بەوی چوو، وێنەی ئەوبوو**

ضارهُ اضرَّ به . آذاه : **زیانی پێگەیاند ، ئازاریدا**

ضاع المسك انتشرتْ رائحتهُ : **بۆنی میسکەکە بڵاوبۆوە**

ضاعف الشيء جعله ضعفين : **دوو ئەوەندەی خۆی لێ کرد**

ضاغط زاحم : **فشاری خستە سەر**

ضاقَ ضدّ إتّسع . الرجُلُ بخل : **تەنگ بوو، ڕەزیل بوو**

ضالٌّ (ج ضُلاّل وضالون) ضائع : **ون بوو**

ضالّةٌ (ج ضوالّ)شيءٌ مفقودٌ يُسعى وراءه : **ئەو شتەی ون دەبێت و دیار نامێنێت و هەر بە دوویا دەگەڕێن**

ضام ظلم . قهر : **ستەمی کرد ، زاڵ بوو**

ضامِرٌ اج ضُمَّر وضوامر) قليل اللحم . هزيل : **کەم گۆشت ، لەڕو لاواز**

ضامنٌ اج ضُمّان وَ ضمنة) كفيل وملتزم : **دەستەبەرو پابەند**

ضأن الشاة . عزلها عن الماعز : **مەڕی لە بزن جیا کردەوە**

ضاهى شابه : **لەوچوو**

ضايقه ازعجه : **بێزاری کرد**

ضَبٌّ اج ضباب واضُب وضُبّان) حيوان من الزّواحف شبيه بالحردون :

**مارمیلکە ، بزنمشك ، بزدمژە**

ضبابٌ سحاب يتكون عادة فوق التلال : **تەم و مژ**



ضبطهُ قهرد وقوي عليه . احكمه : **زاڵ**

**و بەهێز بوو بەسەریدا پتەوی کرد**

ضَبُع اج اضبُع وضباع وضَبُع وضَبُع)

حيوان مفترس من فصيلة السباع :

**کەمتیار**

ضجَّ صاح وجلب لفزعه من شيء

احافه:**هاواری کرد بۆ بە هاناوە چوون لەو شتەی کە لێی نەترسێ**

ضجر بالامر . قلق وتبرم:**لەکارەکە دوودڵ و نیگەران بوو**

ضجرٌ قلق: **دوو دڵ ، نیگەران ، بێزار**

ضجيج اصوات عالية غير منسجمة:**هەراو هۆریا ، گاڵەگاڵ**

ضحّاك كثير الضحك.وسط الطريق: **ئەوەی زۆر پێدەکەنی،ناوەڕاستی ڕێگە**

ضحك ضد بكى : **پێکەنی**

ضحل الغدير . قلّ ماؤه : **ئاوی جۆگەلەکە کەمی کرد**

ضحّى الغنم . رعاها في الضّحى : **مەڕی لە چێشتەنگاودا لە وەڕاند**

ضُحى وقت ارتفاع الشمس من النهار : **چێشتەنگاو**

ضَحيَّةٌ (ج ضحايا) ذبيحة : قوربانیی

ضخَّ الماء ، سكبهُ : ئاوەکەی رژاند

ضخُم كبُر حجمه : قەبارەی گەورە بوو

ضخْمٌ (ج ضخام) عظيم الجسم : کەتە

ضدَّهُ في الخصومة ، غلبهُ : بەسەریدا زاڵ بوو

ضَرَّء ضدّ سَرَّاء : ناخۆشی

ضَرَبٌ عسلٌ ابيضُ غليظ : هەنگوینی سپی پەیت

ضَرِبٌ ماهر في الضَرْب : شارەزای لێدان ، لێدەر

ضَرْبةٌ فساد ، عاهةٌ : خراپە ، نەهامەتی

ضرَّج الثوب بالدَم ، لطَّخهُ : جلەکەی خوێناوی کرد

ضَررٌ (ج اضرار) اذيّة : زیان ، ئازار

ضِرسٌ ( ج اضْراس وضُرُوس) سِنٌّ طاحنةٌ : دانی خڕێ

ضرسَ الشيء ، عضّهُ عضّاً شديداً بالأضراس : بە توندی گەستی

ضرّسهُ جرّبه ، أحكمه : تاقی کردەوە ، پتەوی کرد

ضرع اليه ، خضع : سەری بۆ شۆڕ کرد

ضرمٌ جائعٌ : برسی

ضرمت النار ، اشتعلت : ئاگرەکەداگیرسا

ضرم عليه ، إحتدم غضباً : بە تورەیی بەرەنگاری بۆوە

ضرّهُ الحق به مكروهاً : دەردەسەری تووش کرد

ضرورةٌ (ج ضرورات) حاجةٌ : پێویستی

ضروريٌّ ماتدعو إليه الحاجة بشدّة : زۆر پێویست ، گرنگ

ضريبة (ج ضرائب) ما يُؤديهُ المواطنون من مال للدولة : باج

ضريحٌ (ج ضرائح) قبرٌ : گۆڕ



ضريرٌ ( ج أضرّاء أضرار) أعمى

، كفيف : كوێر ، نابینا

ضعضع البناء ، هدمهُ حتّى

الأرض : باڵەخانەکەی ڕوخاند

و تەختی کرد لەگەڵ زەوی

ضعّف الحديث ، نسبه إلى

الضّعف : فەرموودەکەی بە لاواز دانا

ضِعفٌ (ج أضعاف) الشيء مثلهُ في المتدار :

هێندەی خۆی

ضَعْفٌ ضِدّ قوّة : لاوازیی ، بێ هێزی



ضعيفٌ (ج ضعاف و ضُعفاء وضَعفه) ضدّ

قويّ : بێ هێز

ضغطهُ عصره : گووشی ، تەنگاوی کرد

ضَيّق عليه : تەنگی پێ هەڵچنی

ضَغِنَ عليه ، حقد : ڕقی لێ هەڵگرت

ضفّة جانب النهر أو ساحل البحر : کەناری دەریاو ڕووبار

ضِفدع (ج ضَفادع) حيوان يكثُرُ في



المياه والمستنقعات : بۆق

ضفر الشعر او الحبل ، نسجهُ : لوول

کرد ، پرچی هۆنییەوە

ضفوة العيش ، رغده : خۆش

گوزەرانی

ضفيرةٌ (ج ضفائر) كل خصلة من شعر : **پرچ ، قژ ، بسك**

ضَلَّ حاد ومال عن الطريق أو الحقَ : **لەرێ لایداو گومڕابوو**

ضلال ضياع ، نسيان : **ون بوون ، لەبیرچوون ، ڕێی هەڵە ،لادان لەرێ ی ڕاست**

ضِلْعٌ عظمٌ صغيرٌ منحنٍ من عظام قفص الصدر : **پەراسوو**

ضلعَ إعوجَ ، شبع وارتوى : **خواربۆوە ، تێر ئاو و خۆراك بوو**

ضلع عن الحق مالة،عليه حاد واعتدى: **لەڕاستی لایدا، دەست درێژیی كردەسەر**

ضَلُعَ كان قويًا شديد الاضلاع : **پەراسووەكانی بەهێز بوون**

ضلَّع امال ، ثقل : **لاری كردەوە ، قورسی كرد**

ضليعٌ (ج ضُلَّع) قوي ، واسع الفم : **بەهێز ، دەم گەورە**

ضَمَّ الشيء ، جمعه ، قبضهُ : **كۆی كردەوە ، گرتی**

ضمَّهُ إلى صدره ، عانقه : **باوەشی پیا كرد**

ضمٌّ جمعٌ بين شيئين فأكثر : **دوو سێ شتی دایە پاڵ یەك**



ضمَّاد (ج أضمدة وضمائد) قطعة قماش تستخدم لتغطية الجرح : **لەفاف ، كەرستەی برین پێچان**

ضمانة كفالة : **دەستەبەری**

ضمد عليه ، اشتدَ حقدُهُ عليه، الدَمَ جف وييبس : **ڕق و كینی زۆری لێ هەڵگرت،خوێنەكەی وشك بۆوە**

ضمَّر الفرس جعله يضمر أي يضعف : **ئەسپەكەی لەرو لاواز كرد**

ضمن الشيء ، كفلهُ : **دەستەبەری كرد**

ضمنٌ مرض ملازم ، عاهة مُستعصية : **هەرنەخۆش، دەردی سەخت**

ضمَن الشَيء الوعاء . جعلهُ فيه : **خستییە ناو تورەکەوە**

ضمِنٌ (ج ضمنَى) عاشق مُحبّ . كلٌ. ثقيل لا خير فيه : **شەیداو خۆشەویست ، کول ، قورسی بێ سوود**

ضَميرٌ (ج ضمائر) شعور انسانيٌ باطنيّ يراقب سلوك الشخص : **ناخی دەروون ، ویژدان**

ضَمينٌ (ج ضُمناء) كفيلٌ : **زامن و دەستەبەر ، کەفیل**

ضَنّ بالشَيء عليه . بخل بُخلاً شديداً : **زۆر رژدو بەخیلی و رەزیلی کرد**

ضَنُكَ ضاق : **تەنگەبەر بوو**

ضَنىً مرضٌ أو هُزالٌ شديدٌ : **نەخۆشیی ، لەرو لاوازییەکی یەکجار کاریگەر**

ضَني اِشتدّ مرضُهُ حتّى نحل جسمُهُ : **نەخۆشی زۆر بۆ هێنا تاخستی**

ضَنينٌ (ج اَضنّاء) شديد البخل : **زۆر رەزیل**

ضَهرٌ (ج ضُهور واضْهار) اعلى الجبل. واد . سلحفاة : **لوتکەی شاخ، دۆڵ، کیسەڵ**

ضَوْءٌ (ج أضْواء وضواءٌ) نورٌ : **تیشکی روناکیی**

ضَوْضاء ضجّة وأصوات مرتفعة مختلطة : **هەراو هۆریا ، هەرا ، دەنگە دەنگ**

ضوى اِليه اِنضمّ ولجا : **پەنای بۆ برد**

ضِياءٌ ضوءٌ : **روناکیی**

ضَياعٌ فقدان . تلفٌ . هلاكٌ : **ون بوون ، خراپ بون ، تیاچوون**

ضَيَّعَ أهمل . أتلف . أفقد : **پشت گوێ ی خست ، خرابی کرد ، لەدەستیدا**

ضَيْعةٌ (ج ضيعٌ و ضياعٌ) عقارٌ . أرضٌ ذات غلّة : **خانووبەرە ،خاکی بەرهەم دار**

ضَيْغمٌ (ج ضياغم) اسد . ليث : **شێر ، شێر**

ضَيَّف أنْزل ضيفاً عنْده : **بووە میوانی**

ضَيْفٌ (ج ضيف واضْياف و ضُيوف وضيْفان) نزيلٌ عند غيره : **میوان**

ضِيقُ سوءُ حال ، شدَّةٌ ، فقرٌ : حالْ خراپ ، نەبوونیی ، هەژاریی

ضَيقٌ شكٌ : گومان

ضَيْقٌ ماضاق عنه الصَّدْرُ من حُزْنٍ أو همّ : دڵ تەنگی و خەم و خەفەت

ضيمُ الجبل ، ناحيته : قەدپاڵی چیا




## بابُ الطا ، بەشی (طێ)

ط الحرف السادس عشر من حروف الهجاء : پیتی شانزەهەمە لە ڕیزبەندی پیتە هیجائییەكان

طائِرٌ (ج طَيْر وطُيُور وأطْيار) كلُّ ذي جناحين من الحيوان : باڵندە

طائِشٌ نَزِقٌ : هەڵەشە ، سەركێش

طائعٌ مُطيع : گوێ ڕایەڵ

طائفٌ حارس الليل : پاسەوانی شەو

طائفةٌ (ج طوائِف) فِرْقةٌ ، جماعة من الناس يجمعهم مذهبٌ أو رأي يُميزهم عن سواهم : تیپ ، كۆمەڵە ،دەستەیەك، ئەوانەی لە چوار چێوەی مەزهەب و ئایدیایەك و بیروبۆچوونێك كۆدەبنەوە

طائلٌ(ج طوائل)كثير قدرة،غنًى،فضلٌ،فائدة : زۆر،توانا،دەوڵەمەند،كەڵك،سوود

طاب لذَّ : پێی خۆش بوو

طابةٌ كرةٌ : تۆپ

**طابعٌ** خُلقٌ.طبيعةٌ: **ڕەوشت ، سروشت**



**طابَعٌ** (ج طوابع) خاتم ، مايُطبع به : **ئەنگوستیلە ، مۆر**

**طابع البريد** ، ورقة صغيرة رسميّة تُلصق على الرسائل : **پوول**

**طابق** وافق : **قایل بوو**

**طابَقَ** بين الشيئين ، جعلها على مثال واحد : **وەك یەكی لێ كردن**

**طابَقٌ** (ج طوابق وطوابيق) طبقة واحدة في البناية : **نهۆم**

**طابُورٌ** (ج طوابير) فرقة ، صف منتظم : **دەستە ، ڕیزێكی ڕێك ، خەڵكانێك**

**طاجِنٌ** (ج طواجن) مقلاة : **تاوە ئەوەی شتی تیا سوردەكرێتەوە ، مەقلی**

**طاحِنَةٌ** (ج طواحن) ضرسٌ : **دانی خڕێ**

**طاحُونٌ** (طاحونة) رحًى : **ئاش ، دەستاڕ**

**طاحُونَةٌ** (ج طواحين) بيت الطَّحن : **شوێنی هاڕینی دانەوێڵە**

**طارَ** ارتفع في الهواء : **فڕی ، بەرزبۆوە**

**طار** صيتُه في الناس ، انتشر و ذاع : **ناوبانگی بڵاوبۆوە**

**طارح** ناظر : **وتووێژیان كرد**

**طارد** لاحق ، هاجم : **دوای كەوت هێرشی بردە سەر**

**طارِقٌ**(ج طُرّاق واطراق)ات ليلا،كوكبُ الصُّبح : **بەشەوهاتو،ئەستێرەی بەیان**

**طارئٌ** (ج طُرّاء و طُراء) غريب ، عرضيٌّ زائلٌ : **نامۆ ،كت و پڕ**

**طازجٌ** جديد حديث : **تازەو نوێ**

**طاسٌ** (ج طاسات) اناء من نحاس يُشربُ فيه : **جام ، قاپ**

**طاش** خفّ ونزق ، ذهب عقلُه : **هەڵەشەیی كرد ، عەقڵی لەدەستدا**

طأ طارأسه . خفضه : **سەری دا نەواند**

طاع انقاد : **بەگوێی کرد ، گوێڕایەڵی بوو**

**طاعُونٌ** (طواعين) مرضٌ خبيثٌ ذو حمّى شديدة الحرارة ينتقل إلى الإنسان من الفئران : **نەخۆشی تاعون ، کولێرا ، ڕشانەوە**

**طاغٍ** (ج طغاة وطاغون) ظالمٌ : **ستەمکار**

**طاغوتٌ** ( ج طواغ وطواغيت) شيطان . كلّ ما عُبد من دون الله : **ئەهریمەن ، هەر پەرستراوێك بە دەر لە پەروەردگار ، تاغوت**

**طاغٍ** معتدٍ : **دەست درێژی کەر**

**طاغيةٌ** كثير الظلم : **زۆردار ، ستەمکار**



**طاف** الخيالُ :جاء في النوم: **خەوی پێوە بینی**

**طاف** جال : **گەڕا**

**طافحٌ** ملآن : **پڕ**

**طاقةٌ** قدرة . قوة : **توانا ، هێز ، دەسەڵات**

**طال** الشيءُ . صار طويلا : **درێژ بوو**

**طالبَ** الرجل بحقه . طلبه منه : **داوای مافی خۆی کرد**

**طالبٌ** (ج طلاّب وطلبة) تلميذٌ : **قوتابی ، خوێندکار**

**طالح** (ج طلّح) فاسد : **خراپ**

**طالع** الكتاب . قرأه : **کتێبەکەی خوێندەوە**

**طالعٌ** (ج طلّع وطوالع) هلال ، مايُتنبأ به من سعد أو نحس : **مانگ ، بەختی باش و خراپ**

**طالقٌ** (ج طُلّق وطوالق) المرأة المتزوّجة المحرّرة من زوجها : **ژنێکی تەڵاقدراو**

**طامّةٌ** مصيبة . يوم القيامة : **کارەسات ، ڕۆژی دوایی**



طامحٌ مرتفع : بەرز

طامعٌ جشِعٌ : چاوچنۆك

طاهٍ (ج طُهاة وطُهي) طبّاخ : چێشت لێنەر ، کابان

طاهِرٌ (ج أطْهار) نظيفٌ : پاك

طاولةٌ مائدة من خشب اوْمعدن ، لعبة النَّرْد : مێزلە داریان لەئاسنلروست کراییٚ ، یاری تاوڵە

طاوُوسٌ (ج أطْواس وطواوِيس) طائرٌ حسن الشكل : تاووس

طِبٌّ مهنة أو عِلم يهدف إلى شفاء الأجسام والنفوس، شَهْوَة إرادة : زانستی پزیشکی ، ئارەزوو ، ویست

طِباخَةٌ حرفة الطُّبَّاخ : پیشەی چێشت لێنەریی

طِباعَةٌ صناعة تنقل إلى الورق الكتابة أو الصور : چاپکردن

طبَّالٌ ضاربٌ على الطَّبل : تەپڵ ژەن

طبَّب عالج . الخيّاطُ الثوب ، زاد فيه رُقعةً ليتَّسع : چارەسەری کرد ، پارچەیەکی زیاد کرد لە جلەکان هەتا بەرین بێت

طبخ الطَّعام . انضجه ، لێی نا ، شێوی لێ نا

طبخ اللحم ، شواه : گۆشتەکەی برژاند ، گۆشتەکەی کوڵاند

طبيخٌ مطبوخ : ئەوەی لێ دەنرێ

طبشُورةٌ (ج طباشير وطبشور) قطعة مستطيلة مستديرة من مادةٍ كلسيّة نكتب بها على السبّورة أو اللوح في المدارس : تەباشیر

**طبعَ الكتاب، نقل كلامه بأحرف إلى الورق بالآلات الطابعة: كتێبی چاپ كرد**

**طبعَ الله الخلق ، خلقهم وأو جدهم : دروستی كرد**

**طبعت الدّولةُ النقودَ ، صاغتْها ونقشتها : وڵات پارەی چاپ كرد**

**طُبِع جُبِل : خوی پێ وەگرت**



**طبْعٌ (ج أطْباع وطباع) مثال : نموونە**

**طبْعَةٌ ما يُطبع من الكتاب او الصحيفة: چاپكراو**

**طبْعيُّ منسوب إلى طبْع : سروشتی**

**طبَقٌ (ج اطْباق) إناءٌ كبيرٌ من قشّ وغيره يوضع**

**فيه الطّعام : سینی ، خوانچە ، سەبەتە**

**طبَّق الشيءُ ، عمَّ ، إنتشر، القاعدةَ أثبت صحّتها بالمسائل العلميّة : بوو بە باو، بڵاوبۆوە ، ڕێساكەی بە زانستی سەلماند**

**طبَقةٌ (ج طبقات) مرتبة ومنزلة ، حالٌ : پلەو پایە ، حاڵ و باروودۆخ**

**طبْلٌ (ج طبول واطبال) آلة جوفاء مستديرة مغطاة بجلد من احد وجهيها او كليْهما تُستخدم لضبط الايقاع والألحان : دەہۆڵ**



**طبْلة طبْل صغير : دەهۆڵی بچووك**

**طبْليّةٌ منضدة مستديرة يؤكل عليها أو يرقّق عليها العجين : پنە، فەرشەی نان كردن**

**طبيبٌ (ج أطبّاء و أطبّة) منْ حرفتُهُ الطّبُّ : پزیشك ، دكتۆر**

**طبيخٌ ما طُبخ : چێشت ، شیو**

**طبيعةٌ (ج طبائع) مزاجٌ : خووڕەوشتی مرۆڤ ، سروشتی مرۆڤ**

**طبيعيٌّ منسوب إلى الطّبيعة : سروشتیی**

**طبيعيّاتٌ** علمٌ يبحث عن طبائع الآشياء وما جعله الخالقُ فيها من خصائص وقدرات : **سروشت زانى**

**طِمالٌ** (ج طِحَل واطحلة وطحالات) عضوٌ في جوف الإنسان والحيوان لازق بالجنب الايسر من البطن : **سپڵ ، فاتە ڕەشە**

**طُحالٌ** مَرضٌ يُصيب الطّحال : **نەخۆشی سپڵ**

**طحّانٌ** صانع أو بائعُ الطحين : **ئارد دروستکەرو ئارد فرۆش**

**طحْلَبٌ** وطِحْلِبٌ وطُحْلُبٌ (ج طحالب) نبات طفيليٌّ أخضر اللون يعلو سطح المياه الرّاكدة والوسخة في الأماكن الرطبة : **قەوزە**

**طَحَنَ** الحبّ ونمود . جعله دقيقا : **هاڕی ،دانەویڵەی هاڕی**

**طَحُونٌ** حربٌ . إبلٌ كثيرةٌ ، كتيبة عظيمة : **جەنگ ، گەلە وشتر ، دەستەو گرۆهێکی مەزن و بێ شومار**



**طحينٌ** دقيق : **ئارد**

**طُرٌّ** (ج أطْرار) جماعة : **کۆمەڵێك**

**طرفٌ** جانب . ناحية : **جەمسەر، تەنیشت، لا**

**طرُؤَ** الشيءُ . صار ليّنا ناعماً نضيرا : **نەرم و ناسك بوو**

**طرأ** حدث فجأة : **کت و پڕ ڕوویدا**

**طرّادٌ** سفينة حربيّة سريعة . مكان واسع . يومٌ طويل : **کەشتی خێرای جەنگی ، شوێنی فراوان ، ڕۆژێکی دوورودرێژ**

**طرّازٌ** الذي يطرّز الثّياب : **نەخشێنەری جل و بەرگ**

**طِرازٌ** (ج طُرُز) نمطٌ . شكلُ رسمُ الثوبُ : **ڕەنگە ، شێوە ، نەخشەی جل و بەرگ**

**طرافةٌ** غرابة . حداثة : **دەگمەنی ، تازەیی**

طَرِبَ إهتزَّ فرحا او حزنا : **لەخۆشییا هەژا ، لە ناخۆشیا پەشۆکا**

طَرَّبَ تغنّىَ : **گۆرانی چڕی**

طَرَبٌ ما يُحرك الطرب في النفس من غناء ونحوه : **هەژان و خرۆشانی نەفسە بەهۆی گۆرانیی یان شتی ترەوە**

طَرْبُوش ( ج طرابيش) غطاء تُراثي للرأس : **کڵاو(جۆری تەربووش)**

طُرَّةٌ (ج طرات وطُرر واطْرار) جبْهة : **نێوچەوان ، (لێواری هەموو شتێك)**

طَرْحٌ في الحساب إسقاط عددٍ من عدد اخر : **لێ دەرکردنی ژمارەیەك لە ژمارەیەکی تر ، کەم**

طَرَحَ رمى ، ألقى ، أسقط : **هاویشتی ، فڕێیدا ، کوتای بە زەویدا**

طَرحت المرأة الفت جنينها قبل وقته: **کۆرپەکەی لەبارچوو، زگەکەی لەبارچوو**

طَرَحَ الشيء ، طرحه ، البناء رفعه عاليا. به السفرُ إلى ناحيه كذا ، قذف به إليها : **فڕێیدا ، باڵەخانەکەی بەرز کردەوە ، ڕەوانەی کرد بۆ ئەو شوێنە**

طَرْد (ج طرود) ما يُرسل بالبريد من صناديق ورزم ونحوها طردٌ إقصاء . إبعاد بعنف وشدة : **ناردنی نامە یا کەلو پەل بە پۆستە ، دور خستنەوە ، ڕاوەدوونان**

طَرَدَ أبعد : **دووری خستەوە ، دەری کرد**

طَرَّزَ الثوب ونحوهُ . زيّنه بالخيوط الملوّنة والرسوم : **نەخشی تیا کرد بەداوی ڕەنگاو ڕەنگ و وێنە**



طَرْزٌ شكلٌ : **شێوە ، جۆر ، ستایل**

طَرَشٌ صممٌ : **کەڕیی**

طَرِش أصمَ : **کەڕبوو**

طَرطور : **هاڕاوی تێکەڵ لە ئاردو سیرو لیمۆ**

طُرْطُورٌ (ج طراطير) رجل طويل نحيف . قلنسوة طويلة دقيقة الرأس : **پیاوی بەژن باریکی درێژی لێ دەسەڵات ، کڵاوی درێژی قووچ**

طرُف صار طريفا نادرا : **دانسقە بوو ، خۆش بوو**

طرفُ الشيء (ج أطراف) خاصية . نهايته : **قەراخ ، کۆتاییەکەی**

طرف عينه . اصابها بشيء فدمعت : **چاوی توشی شتێك بوو فرمێسکی لێ هات**

طرفتْ عيْنهُ . تحرّك جفاها بالنّظر : **چاوی تروکاند**

طرَفٌ (ج أطراف) عينٌ . منتهى كلّ شيء : **چاو ، کۆتایی هەر شتێك**

طُرْفةٌ مُلحة . حديث حسن . نُكتة : **قسەی خۆش ، قسەی باش ، نوکتە**

طرقَ الباب . قرعهُ : **لەدەرگای دا**



طرق الطريقَ سلكهُ : **رێگای گرتەبەر**

طرق الشيء دقّه : **کوتی**

طرُوبٌ كثيرُ الطرب : **زۆر شادومان**

طرّى ليّن : **نەرمی کردەوە**

طري صار ليّنا طرِيّاً : **نەرم و شل بوو**

طريٌّ ليّنٌ . ناعمٌ : **نە رم و ناسك**

طريحٌ (ج طرْحى) مطروح : **فرێدراو**

طريدٌ مطرود . هارب . الذي يولد بعد أخيه : **دەرکراو، راکردوو، ئەوەی لەدوای برا کەی لەدایك دەبێت**

طريفٌ (ج طرف وطراف) حديث نادر مُستحسنٌ . مالٌ مكتسب حديثا : **قسەو گوتەیەکی باش و پەسەند ، سامانی تازە کۆکراوە**

طريقٌ (ج طُرق واطْرُق و طرُقات) سبيل واسع يمرُّ عليه الناس : **رێگە ، رێڕەو**

طريقةٌ (ج طرائق) حالةٌ . أسلوب . مذهب سيرة : **چۆنیەتی ، دۆخ ، شێواز ، رێباز ، رێگە ، تەریقەت**

طسْت (ج طسوت) إناء يُستعمل لغسل اليدين مصنوع من نُحاس : **تەشت**

طشْت (ج طشوت) طسْت : تەشت

طعامٌ (ج أطْعِمَة) كلّ مايؤكل : خۆراك

طعْمٌ (ج طعُوم) ما تدركه حاسَة الذوق : تام كردن

طعِم الشيء ، ذاقهُ ، الغصْنُ التحَم بغصن آخرَ من غير شجره : تامی کرد ، موتوربەی کرد

طعَّم الغصن ، وصل به غصناً من غير شجره ليصير من جنس هذا الشجر : موتوربەكرا

طعَّم المريض ، لقَحهُ : نەخۆشەكە ی كوتای

طُعْمٌ (ج طعُوم وأطعام) طعام ، مصْلٌ يلقَح به الجسم ضدّ الأمراض : دان و خۆراكبۆ ڕاوكردن ، دەرزی كوتان

طُعِنَ الرجُلُ ، أُصيب بمرض الطّاعون : تووشی نەخۆشی تاعوون بوو ، تووشی كۆلێرابوو

طعْنَةً (ج طعْن) و طعَنات) أثر الطّعْن : شوێنەواری لێدان و برینداریی

طعِينٌ (ج طعْن) مطعونٌ : پێكراو ، چەقۆ یا ئامرازی تری لێ دراوە

طغا جاوز الحدّ ، البحرُ هاج وتلاطمت أمواجُهُ : سنووری تێپەڕاند ، شەپۆلەكانی دەریا هەڵسا

طغْمةً (ج طُغم وطُغْمات) جماعة أمْرها واحدٌ : دەستەو تاقمە

طغى بالغ في الظلم ، الماءُ إرتفع وفاض : زۆر ستەمی كرد، ئاوەكە بەرز بۆوە

طغْيانٌ ظلْمٌ : ستەم

طفا الشيءُ فوق الماء ، عام : شتەكە سەر ئاو كەت

طفّح جعله يطفح و يفيض : پڕی كرد تاڵیی ڕژا

طفح الإناء أو النهرُ ، امتلأ وفاض : پڕ بوو لێی ڕژا

طفر وثب في إرتفاع : بازدان بۆ سەرەوە

طَفْرَةٌ وثبةٌ إلى اعلى : **بازدان**

طَفَّفَ الوزنَ ، انتقص : **کێشی کەم کردەوە**

طَفِقَ يفعلُ كذا ، شرع وأخذ : **دەستی پێکرد بیکات**

طِفْلٌ(ج أطفال) ولدٌ صغير ،حاجةٌ، سقْطُ النّار : **منداڵ، پێویستی، پشکۆی ئاگر**

طُفُولَةٌ مرحلةٌ من الميلاد إلى البُلوغ : **منالی هەتا کاتی باڵغ بوون**

طَفِيفٌ قليلٌ ، حقيرٌ : **کەم ، بێ نرخ**

طُفَيْلِيٌّ كائن حيٌ يعيش مُتطفّلاً على كائن حيٍّ آخر في داخله أو خارجه : **لەزانستی زیندەوەرزانیدا بریتیە لە ژیانی زیندەوەرێك بەسەر زیندەوەرێکی ترەوە لەناوەوەی یان لە دەرەوە ، مشەخۆر**

طُفَيْلِيٌّ الذي يدخل الولائم من غير ان يُدعى إليها : **خۆتێ هەڵقورتێن**

طَقْسٌ (ج طُقُوس) طريقةٌ ،نظامٌ وترتيبٌ : **رێگە ، سیستەم و رێکخستن**

طَقْسٌ حالة جوية : **کەش و هەوا**

طَقْطَقَ حوافرُ الدّواب ، أصدرتْ صوتاً : **دەنگی پاڵ و سمی ئاژەڵەکانهات**

طَلٌّ (ج طلال و طلل) مطرٌ خفيف ، ندىً حسنٌ ، معجب : **نمەباران شەونم ، باش ، سەرسام**

طِلاءٌ كلّ مايُطلى به قطران : **هەر شتێك بۆ رووپۆشکردن بەکاربێت، قەتران**

طلاقٌ منسخ عقد الزّواج ، تطليق : **هاڵوەشاندنەوەی گرێ بەستی هاوسەرگیری، تەلاقدان**

طَلاوةٌ جمالٌ : **جوانی**

طلب الشيء ، أرادهُ وحاول أخذهُ : **داوایکردو هەوڵیدا بیبا**

طلبٌ مطلوبٌ : **داواکراو**

طَلْبَةٌ سفرةٌ بعيدةٌ : **گەشتی دوور**

طلبة نوع الطلب : **جۆری داواکاری**

طَلَحَ البعيرُ . تعب وأعيا : **وشترەکە ماندوو بوو**

طَلَسَ الشيء، محاهُ : **سڕییەوە**

طَلْسَمٌ (ج طلاسم) ما يستعمله الساحر من خُطوطٍ وكتابات يزعم انها تدفع الاذى عن البشر : **ئەوەی جادووگەر جادووی پێ دەکات**

طَلَعَ صعد . قصد . ظهر . خرج : **سەرکەوت، دەرکەوت، مەبەستی بوو، ڕۆیشت**

طَلعةٌ وجهٌ . ما طلع من كل شيء : **ڕوخسا ،ئەوەی دەردەکەوێت لە هەر شتێك**

طَلَقَ اللسانُ . صار فصيحاً عذب المنطق . وجهُهُ تهلل : **زمانی پاراوبوو ، ڕووی گەشاوە**

طَلْقٌ (ج أطلاق) ألم الولادة . مُطلقٌ غيرُ مقيّد . عذب اللسان : **ژانی منداڵ بوون ، سەربەست ، ئازاد ، زمان شیرین**

طُلُقٌ وطلقٌ غير مقيد . مُشرق الوجه : **ئازاد ، ڕوون گەش ، بەخشندە**

طَلَلٌ (ج أطلال وطلول) ما ظهر من الاثار : **کەلاوە**

طَلَى دهن : **چەوری کرد**

طَليعةٌ (ج طلائع) مقدمة : **پێشەنگ**

طَليقٌ (ج طلقاء) حُر : **ئازاد**

طَمَّ الإناء. ملأهُ . الشيء كثُر : **جامەکەی پڕ کرد ، شتەکە زۆر بوو**

طَما الماءُ . إرتفع وملأ النهر : **ئاوەکە بەرز بۆوە و ڕووبارەکە پڕ بوو**

طَمّاعٌ كثير الطمع : **چاوچنۆك**

طَمأنَ سكن، هدّأ : **دڵیمرکاندەوە ، هێمنی کردەوە**

طُمأنينةٌ . سكينة : **ئارامی**

طَمَحَ بصرُهُ إليه . إرتفع ونظر إليه مُحدقاً . بأنفه تكبَّر . إلى الأمر تطلَّع : **چاوی تێبڕی ، لوتی بەرزکرد ، بۆ کارەکە چوو**

طمحت الدابّة . جمحتْ : **ئاژەڵەکە یاخی بوو**

طمرٌ (ج أطمار) ثوبٌ بال . من لا يملك شيئا : **جلی کۆنە ، خاوەنی هیچ نیە**

طمر الشيء . دفنه : **شاردیەوە**

طمس حجب . نمطى . محى وأزال . الشيء تغيّرت صورته : **دایپۆشی ، سڕییەوە ، وێنەو شێوەکەی گۆڕا**

طمّع جعله يطمع : **چڵێسی پێ کرد**

طمعٌ (ج أطماع) مطموع فيه . أملٌ ورجاء : **تەماعکاری ، ئومێدو هیوا**

طمُوحٌ تطلّعٌ واستشرافٌ : **بەرز خوازی**

طنٌّ (ج اطنان و طنان) وزنٌ مقداره ألف كيلو غراما : **هەزار کیلۆ گرام**

طنّ اصدر صوتا : **دەنگی لێ وە هات**

طنّانٌ شديد الطّنين : **زۆر بەزرنگە**

طائر صغير يطنّ بجناحه ويمتص رحيق الأزهار : **باڵندەی (تەننان) زۆر خێرا باڵەکانی لێك دەدا**

طنبورٌ (ج طنابير) آلة طرب ذات عنق طويل وستّة أوتار : **(تەمبور) ئامێرێکی مۆسیقایە**

طنجرةٌ (ج طناجر) قدرٌ من نحاس . كنايةٌ عن الجبان أو اللئيم : **مەنجەڵی مس ، ئازناوی ترسنۆك و سپڵەیە**

طنفسة وطنفسة (ج طنافسٌ) بساطٌ . حصير : **بەڕە ، ڕاخەر ، حەسیر**



طنينٌ صوتُ الذّباب.صوتُ الاجراس : **گزەگزی مێش،دەنگی زەنگ و شتی تر**

طها الطعام . طبخه . اللّحم شواه : **لێی نا،گۆشتی برژاند،شێوەکەی کوڵاند**

طهارة تطهر بالماء : **پاککردنەوە بە ئاو**

طهّر جعله طاهراً ، الصبيُ ختنه ، الجسم أخلاهُ من الجراثيِم : **پاکی کردەوە ، منداڵەکەی سوننەت کرد ، لەشی لە میکرۆب و ڤایرۆس پاك کردەوە**

طهُر صارطاهرً : **پاکبۆوە**

طهُر نقاء ، خُلوُّ من النَّجاسة والحيض : **پاکیی ، ڕۆژانی پاکی ژن و دووربوونی لەبێ نوێژیی**

طواعيّةً طاعَة : **گوێڕایەڵی**

طوافُ دوران حول الكعبة المشروفة ،جولان: **سوڕانەوە بە دەوری (کەعبە)دا،گەڕا**

طوّافُ كثير الطّواف ، بائع جوّال : **زۆر سوڕانەوە، فرۆشیاری گەڕیدە ، دێوەرە**

طوّافةٌ مرْوحيّةٌ : **هەلیکۆپتەر**

طائرة عموديّة : **کۆپتەر**

طوبَ اجُرٌ : **خشت**

طوبى حُسنى ، خيْرٌ : **چاکە ، خێر ، مزگێنی ، کەیفخۆشی**

طوّعَ بالرّجُل، حمله على ركوب المهالك ، توّههُ وبعّده في الأرض : **تووشی نەهامەت و دەردەسەری کرد ، ڕەوانەی کرد بە زەویدا هەتا نەگەڕێتەوە**

طوْدٌ (ج أطْواد وطوْدَة) جبلٌ مرتفع : **چیای بڵند**

طوْرٌ (ج اطْوار) حالٌ ، هيئة ، تارةً ، قدْ : **دۆخ ، شێوە ، جارێك ، ئەندازە**

طوْعٌ انقياد ، خضوع : **گوێڕایەڵیی ، ملکەچیی**

طوّفَ في البلاد سار فيهحول الشيء طاف: **بەوڵاتدا گەڕا، بە دەوریدا سوڕایەوە**



طوفٌ (ج أطْواف) مايعوم على وجه الماء : **کەڵەك ، چووپ ، ئەوەی لەسەر ئاو دەمێنێتەوە**

طوفانٌ سيْلٌ عظيم مُغرق يجتاح كلٌ شيء : **لافاو**

**طوَّق** الشيء ألبسه طوقًا : **تەوقی کردە ملی**

**طِيبٌ** (ج أطياب و طيوب) حلال . كلّ ذي رائحة عطرة يتطيب به . افضل كل شيء : **شتی ڕەنگە پێدراو ، بۆنی خۆش ، باشترین شت**

**طِيبةٌ** صفاء. حلال : **ڕوون و ساف ، حەلاڵ**

**طيَّر** الطائر . جعله يطير. أطارد : **باڵندەکەی فڕاند ، فڕاندی**

**طيْرٌ** جماعة طيور : **پۆلە باڵندەیەك**

**طيرانٌ** حركة كلّ ذي جناح في الهواء بجناحيه : **فڕین**

**طيْشٌ** خفة . نزق . سفه : **گەوجیی ، هەڵەشەیی ، بێ عەقڵیی ، هەرە پاسیی**

**طيْفٌ** (ج أطياف) خيالُ طائف في النوم : **خەیاڵێکی درێژلە خەودا، خەوبینین**

**طَيْلَسانٌ** (ج طياليس و طيالسة) لباس أخضرُ اللّون يرتديه رجال الدين و يتميّز بأنه غير مخيط : **عەبایەکی سەوزە شێخ و زانایان لەبەری دەکەن**

**طِينٌ** (ج أطيان) تراب مختلط بالماء : **قوڕ**





## بابُ الظاء . بەشی (ظاد)

ظ الحرف السابع عشر من حروف الهجاء : **پیتی حەڤدەهەمە لە ڕیزبەندی پیتە هیجائییەکان**

ظالِم (ج ظُلاّم و ظَلَمَة) جائرٌ : **زۆردار ، ستەمکار**

ظامِئٌ (ج ظِماء) عطشانُ عطشاً شديداً : **زۆر تینوو**

ظاهَرَ ساعَدَ ، عاونَ : **یارمەتی دا**

ظاهَرَ امرأتَهُ أي انتِ مطلقة ، قال لها (انتِ عليَّ كظهْرِ أمي) : **پیاو بە ژنەکەی بڵێ تۆ تەڵاقدرای ، وەك پشتی دایکم وای**

الظاهر من أسماء الله الحسنى: **ناوێکی جوانی پەروەردگارە ، ئاشکرا**

ظاهِرَة (ج ظاهرات وظواهر) أعلى الجبل . شيء مستجد يبدأ بالانتشار بين الناس : **لوتکەی چیا ، دیاردە**



ظُبَةٌ ( ج ظُبات وظُباً وظُبُون) حدّ السَيف : **سەرەنیزە**

ظَبي (ج ظِباء وأظْبٍ) غزال : **ئاسك ، مامز**

ظَبْيَة أُنثى الظّبي ، جرابٌ صغير من جلد ظبْيٍ : مێینەی ئاسک، هەنبانەیەك لە پێستی مامز دروست کراوە

ظَرُفَ حذِقَ ، ظَرُفَ ، بَرعَ : کارامە بوو ، ڕێزدار بوو ، لێهاتوو بوو

ظَرْفٌ (ج ظُرُوف) وعاء ، حالُوضعْ ، كياسةً : قاپ و گونیە ، بارودۆخ ، هەلوومەرج ، زەرف

ظريفٌ (ج ظُرفاء وظراف) كانَ كيّساً ذكياً وبارعاً : ژیر، زەریف

ظَعَنَ القومُ ، ارتحلوا عن ديارهم إلى موضع آخر : کۆچیان کرد

ظفر بالشَّيء ، فازَ به وناله ، على عدوه ، غلبَهُ وقهره : سەرکەوت و بەدەستی هێنا ، بەسەر دوژمنەکەیدا زاڵ بوو

ظُفُرٌ (ج أظْفار) مادّة قرنيّة تنبت في أطراف الأصابع : نینۆك



ظَفَرٌ غَلَبَةٌ : زاڵ بوون

ظَلَّ الشَّيء ، دام ظلّهُ : مایەوە

ظِلٌّ (ج ظلال وظُلُول أظْلال) ضوء شعاع الشّمس اذا سترها حاجزٌ : سێبەر

ظلامٌ ذهاب النُّور : تاریکی

ظلاّم كثير الظلم : زۆر ستەمكار

ظُلامة مايحتمله الإنسانُ من ظُلْم : ئارام گرتنی مرۆڤ لەسەر ستەم و زۆرداری ، ئەو زوڵمەی لە مرۆڤ دەکرێ

ظُلّةٌ ما أظلّك من شجرٍ وغيره : ئەوەی سێبەرت بەسەر دروست دەکات لە درەخت و شتی تر

ظلع عرج في مشية : شەل بوو لە ڕۆیشتندا

ظلِعَ عرجَ وغمَز في المشْي : **شەلین لە ڕۆیشتندا**

ظِلْف (ج ظُلُوف وأظْلاف) ظُفر مُشقوق للبقرة ونحوها من الحيوانات : **سمی ئاژەڵ**

ظلم جار وجاوزَ الحدَّ ، بغى : **ستەمی کردو سنوری تێپەڕاند ، خراپەی کرد**

ظلم الليلُ صار مُظْلِماً : **شەو تاریك بوو**

ظُلْم جوْر : **ستەمکاری**

ظَلْماء ظلام شديد دامسٌ : **تاریك**

ظُلْمة (ج ظُلَم وظُلُمات) ذهابُ النور : **تاریکی**



ظَليلٌ دائم الظلّ :

**سێبەردار ، بەردەوام سێبەرە**

ظَليلَة مُستنقع الماء في أسفل الوادي :

**گۆماو ، ڕەمز**

ظَمأ عطشٌ :

**تێنویەتی**

ظَمِئَ عطش ، إلى كذا إشتاق إليه : **تینوی بوو، هۆگری بوو**

ظَنٌّ (ج ظُنُون) شكٌ، إدراك الذهن الشيء مع ترجيحه : **گومان، درك پێکردن**

ظنّانٌ سيّئُ الظنّ : **بەد گومان**

ظنين غير موثوق به ، متهم قليل الخير : **بەگومان ، تۆمەتبار، بێ خێرو بێر**

ظُهارٌ ألم الظَهر ، جانب قصير من الريش : **پشت یەشە ، قەراخی کورتی پەڕ**

ظِهارَة (ج ظهائر) ظاهر الشيء : **لە نیوەڕۆدا ڕۆیشت**

ظُهْرٌ (ج أَظْهار وظُهُور) وقت انتصاف النَّهار : **كاتی نیوەڕۆ**

ظَهَرَ على السِّرِّ، اطّلع عليه : **نهێنییەکەی بۆ ئاشکرابوو**

ظَهِرٌ من يشتكي ظَهْرَهُ : **ئەو کەسەی تووشی پشت ئێشە بووە**

ظِهْرِيٌّ (ج ظَهارِيّ)ما يَجْعله الإنسان وراء ظهره و ينساهُ: **فەرامۆشکار،لەبیرکراو**

ظَهِيرٌ مُعِينٌ : **یارمەتیدەر**

ظهيرةٌ (ج ظهائر) إنتصاف النهار : **نیوەڕۆ**




## باب العين . بەشی پیتی (عەین)

ع الحرف الثامن عشر من حروف الهجاء : پیتی هەژدەهەمە لە ڕیزبەندی پیتە هیجائییەکان

عائِبٌ ذو عيب : عەیبدار

عائِدٌ (ج عُوّاد وعُود وعوّد) زائر المريض، راجع : سەردانی کەری نەخۆش، گەڕاوە

عائِدَةٌ (ج عوائد) عطيّة ، منفعة : بەخشش، سوود

عائِقٌ (ج عَوائِق وعُوّق) مانع ، حاجز : ڕێگر ، کۆسپ ، تەگەرە

عائِلٌ (ج عالة وعُيَّل) كافٍ مَعيشةَ اهله ، مُفتَقِر : دەست کورت ، هەژار

عائِلةٌ من يعيشون في بيت واحد من الآباء والأبناء والأقارب: خانەوادە ،خێزان

عائِمٌ سابح ، طافٍ : مەلەوان ، سەر ئاو کەوتوو

عابَ صارَ ذا عَيب : عەیبدار بوو

عابِثٌ مستخفٌّ بالدِّين وغيره ، لاعبٌ ، هازِلٌ : گاڵتەو سووکایەتی کردن بە ئایین ، یاریکەر ، گاڵتەچی

عابِدٌ (عبدة وعُبّاد وعُبُد) مُوحِّدٌ : خواپەرست

**عابِرٌ** (ج عُبَّار وعبرة) غير ثابت،مُسافر ،ماضٍ : **ناجێگیر ، ڕێبوار، بەسەر چوو**

**عاتٍ** (ج عُتاة وعُتيّ) جبّار،ظالم، مُجاوز الحدّ : **زۆردار ، ستەمکار، سنوور شکێن**

**عاتَب** لام . وبّخ : **لۆمەی کرد ، سەرزەنشتی کرد**

**عاتِقٌ** (ج عواتق وعُتُق) ما بين المنكب والعنق : **شان ، شەرابی کۆن**

**عاثَ** افسَد : **خراپی کرد**

**عاثِرٌ** (ج عواثر) قليل الحظ . حبالةُ الصّائد : **بەدبەخت ، بەت و تۆڕی ڕاوچی**

**عاجٌ** ناب الفيل : **کەڵبەی فیل ، قۆچی فیل**

**عاجِزٌ** (ج عواجز) غير قادر : **بێ توانا ، بێ دەسەڵات**



**عاجِلٌ** مُسْرِعٌ : **خێرا ، بەپەلە**

**عاجَلَ** بادر،سبق: **دەست پێشخەری کرد، پێشکەوت**

**عادَ** المريض . زارهُ : **سەردانی نەخۆشی کرد**

**عادَ** رجع : **گەڕاوە ، هاتەوە**

**عادَةٌ** (ج عادات وعوائِد) نمطٌ من السّلوك يُعتاد

به : **ئەوەی مرۆڤ دەڵی پێوە دەگرێت ، خوو ، عادەت ، سروشتی وایە**

**عادل** وازن . أعادة الأعوج الى استقامته : **یەکسانی کرد، ڕاستی کردەوە**

**عادِلٌ** مُنْصِفٌ . ضدّ ظالِمٌ : **بەداد ، دادپەروەر ، پیاوی ڕاست**

**عادَى** خاصم . باعد : **دوژمنایەتی کرد ، دووری خستەوە**

**عاديٌّ** نسبة إلى عادة : **نەریتی ، باوی**

**عادِيةٌ** (ج عواد) خيْلٌ مُغيرة : **ئەسپی دابەستەی هەڵمەتبار لە جەنگا**

**عاذ** بفلان من كذا . إحْتمى به . لجأإليه : **خۆی پێ پاراست ، پەنای بۆ برد**

**عاذِلٌ** (ج عُذّل و عُذّال وعذلة) لائم : **گازاندەکار ، لۆمەکار**

**عار** (ج عُراة) من ليس عليه ثياب : **ڕووت**

عارٌ (ج أعيار) عَيبٌ،ما يُعَيّر به الإنسان من قول او فعل : **شوورەیی، شەرمەزاریی**

عارية خُلصٌ : **دۆستی گیانی بەگیانی**

عارض ناقض و قاوم ، قابل الشيء بالشيء : **بەرگری کرد ، بەراوردی کرد**

عارضٌ صفحة الخد ، مانع : **روو ، ڕێگر**

عارضةٌ (ج عوارض) خشبة عُليا يدور فيها الباب ، صفحة الخدّ ، ناحية : **چوارچێوەی دەرگا روو ، لا ، لای ڕووەمەت**



عارمٌ (ج عرمة) شرسٌ مؤذ ، يومٌ عارمٌ ، نهاية في البرد : **زیان بەخش، کۆتا ڕۆژی سەرما**

عاز إحتاج ، افتقر : **پێویستی بوو ، هەژار بوو**

عازفٌ لاعبٌ بآلات الطرب : **ژەنیار**

عاش صارَ ذا حياة : **ژیا**

عاشر خالط ، صاحب : **لەگەڵی تێکەڵ بوو ، هاوڕێیەتی کرد**

عاشقٌ (ج عُشاق) مُغرمٌ ، مَنْ تعلق قلبه بأحد : **شەیدا، دڵدار ، خۆشەویست**

عاشوراء يوم مصرع الحُسين حفيد الرّسول محمد (ﷺ) في العاشر من مُحرَّم : **ڕۆژی شەهید کردنی ئیمام (حسین) نەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لەدەی موحەڕەم**

عاصٍ (ج عُصاة) مُتمرّد ، خارج عن الطّاعة : **یاخی ، لەفەرمان دەرچوو**

عاصِرٌ (ج عصرة) قليل الخير بخيل، مُمْسِكٌ : **کەم خێر، ڕەزیل، دەست گرەوە**

عاصِفةٌ (ج عواصف) ريحٌ شديدةٌ : **گەردەلوول**

عاصِمةٌ (ج عواصِم) قاعدةُ البلاد ، مدينة تتركز فيها النواحي السياسية والاقتصادية : **بنکەی وڵات ، پایتەخت**

عاضد ناصر ، عاون : سەری خست ، یارمەتی دا

عاطِرٌ (ج عُطُر) مُحِبّ العطر : ئارەزوومەندی گوڵاو

عاطِفَةٌ (ج عواطف) شفقة ، حنانٌ : بەزەیی ، سۆز

عاطِلٌ لا مال له ولا عمل : بێ ئیش و بێ کار

عاف کَرِهَ فترك ، ملّ : قێزی لێ بۆوەو بەجێ ی هێشت ، بێزار بوو

عافى الله الرجل ، دفع عنه المرض والبلاء والسّوء : خوای گەورە شیفای داو چاکی کردەوەو لەخراپەی دوور خستەوە

عافِيَةٌ (ج عوافٍ) صحة تامّة ، طالب فضل او رزق : تەندروستی تەواو ، داواکاری چاکەو ڕۆزی ، بێ نەخۆشیی

عاقَ مَنع ، أخّر : ڕێی لێ گرت ، دواییخست

عاقِبَةٌ (ج عواقب) جزاءٌ بالخير ، نسلٌ ، نتيجة : پاداشت دانەوە بەچاکە ، نەوە، ئاکام و دەرئەنجامی شتێك ، ئەنجام ، سەرئەنجام

عاقَدَ عاهد : پەیمانی لەگەڵ بەست

عاقَرَ داوم ، لازم ، فاخر : بەردەوام بوو ، دەقی پێوەگرت ، شانازی کرد

عاقِرٌ (ج عواقر) لا تلد : نەزۆك

عاقِلٌ (ج عُقلاء وعُقّال) مُدرك ، حكيم : ژیر ، دانا ، تێگەیشتوو

عاكس مانع ، عارض : بەرهەڵستی کرد ، سەرپێچی کرد

عالٍ مُرتفعٌ ، شاهق : بەرز ، بڵند

عال كفل ، ضمن ، ساعد : بەخێو کردن ، یارمەتی دا

عالةٌ فقرٌ ، حاجة : هەژاری ، پێویستی

عالج المريض ، داواهُ : چارسەری کرد



عالم (ج علام وعالمون) متخصص بالعلم العميق : **زانا**

عالم (ج عوالم وعلالم وعالمون) خلق . كون : **دروستكراو ، جيهان**

عامّ شامل : **گشتی**

عام (ج أعوام) سنة : **ساڵ**

عامة (ج عوام) ناس عاديون من ابناء الشعب : **خەڵکی گشتی**

عامر (ج عمار وعامرون) معمور . مسكون : **ئاوەدان ، نیشتەجێ**

عامل (ج عمال وعملة) كل من يعمل بيده : **کرێکار**

عاند خالف . عارض. تمسك برأيه : **پێچەوانەی ئەو هەڵسوکەوتی کرد ، دژی بوو ، کەللەڕەقیی کرد**

عانس (ج عوانس وعنس) من النساء او الرجال الذين كبروا في السن لم يتزوجوا : **قەیرەی کوڕو کچ**

عانى قاسى . كابد : **چەوساندییەوە ، چێشتی**

عاهة آفة . مرض : **بەلا ، نەخۆشیی**

عاهر (ج عهار) فاجر . زانٍ : **داوێن پیس ، زیناکەر**

عاهل (ج عواهل وعهال وعهل) ملك : **پاشا**

عاهن (ج عواهن) ثابت . حاضر . عاجل : **جێگیر ، ئامادە ، خێرا**

عاون **ساعد : یارمەتی دا**

عاين رأى بعينه . فحص : **بەچاوی خۆی بینی ، پشکنی**



عبّ الماء . جرعه . شربه بلا تنفس : **دەمی پێوەنا ، هەڵی قوڕاند**

عب (ج أعباب و عباب) كم : **سەر قۆڵی جل و بەرگ**

عبّ برد : **تەزرە**

عَبُ البحر ، كثُرَ موجُه وارتفعَ : شەپۆلەکانی زۆربوون و بەرز بوونەوە

عبء (ج اعْباء) حِملٌ ، ثِقلٌ ، عِدْلٌ : بار ، بار گرانی ، باری قورس ، ڕاستی

عبّأ الشيء ، هيّأه ، جهَّزهُ : ئامادەی کرد

عباءة كساء مفتوح من امام يُلبس فوق الثياب :عەباءالأپۆش

عُبابٌ مُعظمُ السّيل ، البحر ، موْجه : لافاو

عُباب البحْر ، موْجُهُ : شەپۆل

عَبابٌ شُرب الماء من غير تنفسٌ : هەڵقوڕاندنی ئاو

عبادةٌ إقامة الشّعائر الدّينيّة : پەرستش ، خوداپەرستیی

عِبارةٌ كلام دالّ على ما في النّفس أفكار ومعانٍ : دەستەواژە

عَبثَ لعب وعَمِل ما لا فائدة فيه : یاری کردو کاری بێ سوودی ئەنجامدا

عَبّدَ الطّريقَ ، ذلّلهُ ومهّدهُ : قیرتاوی کردو تەختی کرد

عَبِدَ ندمَ : پەشیمان بوو

عَبِدَ عليه ، غضبَ عليه : لێی توڕە بوو

عَبَدهُ لزمهُ ولم يفارقهُ : گرتی و لێی جیانەبۆوە

عَبْدَ مُلكَ هو و آباؤهُ من قبل : خۆی و باوانی لە ڕابردوودا کۆیلە بوون

عَبْدٌ (ج عبيد وعباد وعبدة) إنسانٌ ، مملوكٌ ، رقيقٌ : مرۆڤ ، کۆیلە ، بەندە

عبَرَ الرّجلُ ، حزن وسالتْ عبرتُه : غەمبار بوو ، فرمێسکی هاتەخوار

عبرالعين ، دمعتْ : فرمێسکی ڕشت

عبر قطع ، إجتاز ، مضى : بڕی ، تێپەڕی ، گوزەرا

عبْرانيٌّ يهوديٌّ : جولەکە(پیاو)

عبر انيّةٌ يهوديّةٌ ، لغة اليهود ، زمانی جولەکە ، زمانی عیبری ، جولەکە (ژن)

عبره (ج عبر ، وعبران) دمْعة : فرمێسك ، ڕۆندك

عبرة ( ج عبر) عظة : پەندوئامۆژگاری ، وانە

عبس جمع ما بين عينيه . قطب وجهُ : خۆی بە توورە نیشاندا، ڕووی گرژ کرد

عبس إتّسخ : پیسبوو

عبس الوسخ عليه ، يبس : لەسەری وشك بووەوە ، چڵك وشك بووەوە لەسەری

عبق الطّيبُ بهِ ، لزق : بۆنی خۆشی گرت ، پێی وە نووسا

عبق الرجلُ بالشيء ، اولع به : عاشقی بوو

عبَق رائحة الطّيب ، صيُرها تنْتشرْ : بۆنی خۆشی بڵاوکردەوە

عبْقر السَّرابُ ، تلألأ : بریقەی دایەوە

عبْقريٌّ نسبْةٌ إلى عبقر : كل يُتعجّبُ من كماله وقوّته وذكائه : بلیمەت ، زۆرزان ، دانا

عبْقريّةٌ قوّةُ الخلْق والإبداع عند الشاعر أو الكاتب بلیمەتیی، دانایی، ئەفرێنەر

عُبوديّة إستْرقاق : بەندایەتی

عبُوسٌ كثير العُبوس : زۆر مۆن و ڕووگرژ

عبيرٌ أخلاط من الطّيب : چەند بۆنێکی خۆش

عتا إستكبر و جاوزَ الحدّ : لەخۆی بایی بوو و لە سنوور چووە دەرێ

عتابٌ لومٌ : سەرزەنشت

عتادُ (ج أعْتدة وأعْتُدو عُتُد) ما أُعد لأمرما : کەرەستەو کەل و پەلی ئامادەکراو

عتّالٌ حمّالٌ بالأجرة:حەمماڵ ، کۆڵهەڵگر

عتبٌ لومٌ ، نقصٌ وفسادٌ : گازاندە ، لۆمە، کەم و کورتی و خراپە

عتب لامه على مكروه فعلهُ : لەسەر خراپەیەك كە ئەنجامی داوە لۆمەی کرد

عَتْبةٌ منعطفُ الوادي : لای خوارەوەی دۆڵ و شیو

عَتَبَةُ(ج عتبات و عتب) كلّ مرقاة من الدّرج : هەر پێ پلیكانەیەك یان جێ پێیەك ، ڕێزێكی پەیژە

عتم عن الأمر ، كفّ عنه : وازی لێ هێنا

عتم الليل ، مرّ قسم منه : بەشێكی شەو ڕۆیی

عَتَمةُ ظلمة الليل ، إبطاء: تاریكی شەو ، هێواش و خاوە خاو

عتيقٌ (ج عُتقاء وعُتُق) قديم ، عبدٌ حُرٌر : كۆن ، بەندەی ئازاد كراو

عُثّةَ (ج عُثث وعثاث) سوسةٌ تأكل الصوف : مۆرانەی خوری

عَثَر زلّ ، سقط ، وجد : هەڵەنگوت ، كەوت ، دۆزییەوە

عجّ إشتدّ صاح ،زجر دفع : بەهێز بوو، هاواری كرد ، سەرزەنشتی كرد ، پاڵی پێوەنا

عَجاجٌ غبارٌ ، دُخانٌ ، احمق : تۆزو خۆڵ ، دوكەڵ ، گێل ، خۆڵبارین

عُجالةٌ ما يُعجل من شيء : ئەوەی پێش دەخرێ لە هەر شتێك

عجبٌ (ج اعجابٌ) روعة ، تأخذالإنسان عند استعظام الشيء : سەرسوڕمان

عجب من الأمر ، اخذه العجب منه : بەسەر سامییەوە وەری گرت

عُجّةٌ طعام من بيض وطحين مقليّ بالسّمن او بالزّيت : هێلكەو ڕۆن بە ئارد سووركراوە بە ڕۆن یان زەیت ، كولیچە

عجْرفةٌ تكبُر ، جفوةٌ في الكلام : لەخۆبایی بوون ، قسە ڕەقی

عجْرم الرجلُ ، اسْرع : خێرابوو

عجزَ لم يقدر ، كبُر وصار عجزا : نەی توانی ، پیر بوو

عجف ترك الطعام : وازی لەخواردن هێنا

عجف عن فلان، تجافاه : لێی دوور كەوتەوە

عجلٌ (ج عُجول وعجلة و عجال) ولد البقرة



: گوێرەکە

عجل اسرع : پەلەی کرد

عجّل اسرع ، حضّ : پەلەی کرد ، دەست و بردی کرد

عجْلانُ (ج عجال وعجالى و عُجالى) مُسرع : خێرا

عجلةٌ(ج عجل و عجال واعْجال)سُرعة، خفّة دُولاب: خێرایی، سوکەڵەیی، دۆلاب

عجم الكتاب او الحرف ، نقطهُ بالسّواد : بە نوقتە سەرو بۆری بۆ دانا

عجُم صار في لسانه لُكنة ، فهو اعْجَمُ : لاڵە پەتەبوو

عجمَ الشيء ، امتحنه : تاقی کردەوە

عَجم العود ، عضّهُ ليعلم صلابتهُ من رخاوته : گازی لێ گرت تا ڕەقی و نەرمییەکەی بزانێ

عجْماء (ج عَجْماوات) بهيمة : ئاژەڵ

عجْمَةٌ صخرة صُلبة : بەردی ڕەق

عَجْوَةٌ تمرٌ مخلوط بعضه ببعض : خورمای جۆری عەجوەی تێکەڵکراو ، جۆرە خورمایەکی شاری مەدینە

عجوزٌ مُسنٌ ، متقدم في العمر : پیرو بەتەمەن ، بەساڵاچوو

عجُولٌ كثيرُ العجلة ، منيّةٌ : زۆر بزێو ، مردن ، ئەجەل

عجيبَةٌ (ج عجائب) عملٌ او شيء خارق يُتعجّب منه : کارێکی لەڕادەبەر سەیر

عجيفٌ (ج عجْفى) مهزول ، ضعيف : لەڕو بارێك،لاواز

عجين طحين مخلوط بالماء : هەویر

عدٌّ (ج اعْداء) ماءٌ جارٍ لا ينقطع : ئاوی ڕۆیشتووی بێ بچڕانەوە

عدّ حسب ، ظنّ: ژماردی ، وایزانی ، وای دانا

عدا جرى وركض : ڕای کردو غاریدا

عداعليه وثب : پەلاماری دا ، بازی دا

عدا ظلم : ستەم

عدا عن الأمر ، صرفه وشغله : دووری خستەوەو سەری قاڵی کرد

عدا كلمة للإستثناء : جگە لە

عَدَّاءٌ شديد العَدْوِ جيِّدُهُ : زۆر خێرا ڕادەکا ، یاریزانی ڕاکردن

عدادٌ عطاء : بەخشین

عدادٌ وقت الموت ، مسٌ من جُنون : کاتی مردن ، نیمچە شێتی ، سەرەمەرگ

عدّادٌ جهاز آلي يقيس المسافة التي تقطعها السيّارة : ئامێری پێوانەکردنی خێرایی و ڕێگا لە ئوتومبێل دا



عَداوَةٌ خُصومة ، معاداة : دوژمنایەتی

عُدَّةٌ (ج عُدد) إستعداد : ئامادەبوون

عِدَّةٌ (ج عِدَد) جماعة ، مقدار ، كمّية : كۆمەڵ ، ئەندازەیەك ، چەند

عدّد الشيء ، احصاهُ وجعلهُ ذا عددٍ : ژماردی و ژمارەی بۆ دانا



عدسٌ نبات يؤكل حبّه مطبوخا : نیسك

عدسةٌ ما ترى من خلاله العين : هاوێنە

عدسة لاصقة، زجاجة طبّيّة للنَظر تُلصق بقرنيّة العين: هاوێنەی لکاو بۆ چاو

عدسة الكاميرا ، عين الكاميرا : زوومی کامێرا

عدل عن الطريق ، مال عنه : لە ڕێگا لایدا

عدل الشيء عدلاً ، أقامه وسوّاهُ : ڕاستی کردەوە

عدل في حُكمه ، حكم بالعدل : دادپەروەری کرد

عدل جار . ظلم : **زۆرداری کرد ، ستەمی کرد**

عدلْ (ج اعدال) إنصاف . مساواة . استقامة : **دادپەروەری ، یەکسانی، ڕاست**

عدلْ عادلْ : **دادپەروەر**

عدّل اقام . سوّی : **ڕاستی کردەوە ، ڕێکی خست**

عدمَ فقدان المال . فقرً : **لەدەستدانی ماڵ ، هەژاری**

عدم المال فقدهُ : **ماڵەکە ی لەدەستدا ، هەژار بوو**

عدُم كان أحمق وغبيّا : **گێل و گەمژە بوو**

[redacted]

عدن الارض . سّمدها : **پەینی پەزەویدا کرد**

عدن الحجر . قلعه : **بەردەکەی هەڵکەند**

عدن البلد . توطّنهُ : **تیا جێنشین بوو**

عدوَ حجرٌ رقيق يُستر به الشيء : **بەردی تەنك**

عدوّ (ج اعداء) خصمٌ : **دوژمن**

عُدوانٌ هجوم . اعتداء . ظلمٌ : **هێرش ، دەست درێژی کردن ، ستەم**

عدوى انتقال المرض من مريض الى صحيح . فساد : **گواستنەوەی نەخۆشی ، خراپە**

عُدى اماكن مرتفعة : **شوێنە بەرزەکان**

عدّى الشيء . اجازهُ وانفذهُ : **ڕێگەی پێدا**

عدّا لفعل . جعلهُ متعدّيا : **کارەکەی کردە تێپەڕ**

عدى (ج اعداء) ناحية . مقاطعة : **ناوچە ، کەرت**

عدى أعداء . غُرباء : **دوژمن ، غەریب و نامۆ**

عديدٌ (ج عدائد واعْداد) ندٌ . قرنٌ . مثيل : **هاوچەشن ، لەیەکچوو ، هاو وێنە**

عديد عددٌ كثير : **ژمارەیەکی زۆر**

عديلٌ (ج عُدلاء وأعْدال) نظير ، مثيل : **هاوتا ، هاوشێوە**

عديلُ الرجل ، زوجُ أخت إمرأته : **ئاوەڵزاوا ، وڵداشزاوا**

عديمٌ (ج عُدماء) فقير لا مال له : **هەژار ، نەدار**

عذابٌ (ج أعْذبة) كلُّ ما صعُب على الإنسان وشق على نفْسه ، **ئازار ، ئەشكەنجە**

عِذارٌ (ج عُذر) شعرٌ يحادي الأذن من جانب اللّحية : **زوڵف ، بسك**

عِذارٌ خدٌّ ، حَياء : **کوڵم ، شەرم**

عَذَبَ ترك الأكلَ لشدّة العطش : **لەتینوان هیچی نەخوارد**

عَذَبَ عنه ، كفَّ : **وازی هێنا**

عَذَرَ كَثُرت عيوبُه وذُنوبُه : **کەم و کوڕی و تاوانی زۆر بوو**

عذرَ الفرس ، الجمهُ : **شەتەکی دا**

عذْراءُ (ج عذارى وعذارٍ وعذْراوات) فتاة بكْر : **کچ ، کیژ**

عَذَل لامَ : **سەرزەنشتی کرد**

عراء فضاء لا يُستَتر فيه بشيء : **بیابان ، چۆڵەوانی**

عرّاف مُنجِّم : **ئەستێرەناس**

عِراك قتال : **شەڕ**

عرَّب نقل إلى اللغة العربيّة : **گۆڕییە سەر زمانی عەرەبی ، وەریگێڕا بۆ سەر زمانی عەرەبی**



عربة وسيلة نقل ذات دواليب تجرُّها الحيوانات : **گالیسکە ، عەرەبانە**

عَرْبدةً سوء خُلق : **خوی خراپ**

عَرْبُونٌ (ج عرابين) ما يدفعه المشتري مقدَماً قبل شراء السلعة : **دانی پێشەکی لە کاتی کڕیندا ، پێشەکی ، بیع**

عرَجَ  مشى مشيةً غير مُتساوية : شەل

عرزالٌ (ج عرازيل) كوخ يبنى من الأغصان فوق الشجر او في الحقل : خانوچکه ، کۆشك

عُرسٌ (ج اعراس) زُمافٌ . طعام الوليمة :  ئاھەنگی بووك گواستنەوە ، نان خواردنی ڕۆژی بوکێ

عرْش  (ج اعْراش وعُرُوش) سريرُ المَلك . مُلْكٌ :  تەختی پاشایەتی ، ماڵ و موڵك ، عەرشی خوا

عَرشَ  بنى عَرْشاً اي ما يُسْتَظلُّ بِهِ :  کەپرێکی دروست بۆ سێبەر ، سایات

عَرْصَة (ج اعْراص وعِراص وعرَصات) فناء الدار . ساحةٌ واسعة بين البيوت لابناء فيها :  حەوشە ، گۆڕەپان

عَرُضَ  صار عريضاً :  پان بوو

عرَّضَ الشيء . جعلهُ عريضاً :  پانی کرد

عرَّضَهُ للهلاك . صلبهُ عرضاً له :  خستیە مەترسییەوە ڕووبەڕووی لەناو چوونی کردەوە

عَرَضٌ (ج اعراض) ما يزول ولايدوم :  ئەوەی سەر ھەڵئەدات و پاشان نامێنێت

عَرض(ج عروض وعِراض واعراض)ضدّ طول، متاع،جبل:پان، کەل و پەل، چیا

عرَضَ الشيءَ ، اظهرهُ وابرزهُ :خستییە ڕوو و پیشانیدا

عِرْضٌ  حسبٌ :  وەجاخ زادە ، ڕەچەڵەك ، شەرەف

عِرْضٌ ما يُمدح ويُذمّ من الإنسان :  پیا ھەڵدان یان ئەنگ کردنی مرۆڤ



عارِضٌ سحاب عظيم  :  ھەوری گەورە

عرضٌ بدَنٌ :  جەستە

عِرْضٌ نفس :  دەروون

عُرْف  ما تعارف عليه الناسُ من عاداتهم و معاملاتهم : دابونەریت ، کەلتوور

عُرف مكان مُرتفع : **شوێنێكی بەرز وبالا**

عُرْف لحمة مستطيلة في على راس الدِّيك : **پۆپنە (گۆشتێكی سووری لاكێشەییە بەسەری كەڵەشێرەوەیە)**

عرفَ الشيء ، أدْركهُ بحاسةٍ من حواسّه : **زانی**

عرفات جبل قرب مكّة المُكرمة يقف عليه الحُجاج : **كێوی عەرەفە لەنزیك مەككە حاجیان لەسەری دەوەستن**

عِرْق (ج عُروق واعْراق) اصل الشيء : **رەگی هەر شتێك**

عَرِقَ الرجلُ ، رشح جلْدهُ : **ئارەقی كردەوە**

عَرَقٌ ماءٌ يرشحُ من الجسد : **ئارەق**

عَرَقٌ ندى الحائط : **دیوارەكە شێی دا ، تەڕەشوح ، شێ**

عَرَقٌ صفٌ من الحجر : **ڕیزە بەردێك**

عَرْقلَ اعاق ، اخَّر : **تەگەرەی تێ خست**

عِرْقِيٌّ عُنصريٌّ : **ڕەگەز پەرست**

عَرم العظْم ، نزع ما عليه من لحم : **گۆشتی بە ئێسكەكەوە نەهێشت**

عرمَ الصّبي امّهُ ، رضعها : **منداڵەكە مەمكی دایكی مژی**

عرمْرمٌ جيشٌ كثيرٌ شديد : **سوپای زۆروبەهێز**

عُرُوبةً طباع وخصائص الشّعب العربيّ : **ناوێكە مەبەست پێ ی تایبەتمەندی و ڕەگەزی عەرەبییە**

عُرْوةٌ (ج عُرى) ما يدخل فيه الزرّ ، مقبض الإبريق ونحوهِ : **كونی قۆپچە ، قوڵف و دەسكی مەسینەو شتی تر**

عرُوض علمُ ميزان الشّعر : **كێشناسی**

عري من ثيابه ، خلعها : **جل و بەرگی داكەند**

عريضٌ (ج عراض) ذو عرض : **پان**

عريضةُ صحيفة او رسالة تُعرض فيها حاجة من الحاجات على حاكم او مسؤول : عەریزە ، عەرزو حاڵ ، داواکاری

عريقٌ الذي له عرقٌ ونبلٌ في الكرم والأصل : خانەدان ، خاوەن ڕەچەڵەکی پاکیزەو ڕوناك

عريقٌ نحيفُ الجسم خفيفُ الروح : ناوقەد باریکی ڕوح سوك

عريكةٌ (ج عرائك) سلاسةُ الخُلق : ڕەوشت نەرمی



عرينٌ (ج عُرُن) مأوى الأسد : لانەی شێر

عَزَّ صار عزيزاً ، قوي : ئازیز بووبەهێز بوو

عِزٌّ خلاف ذُلّ : سەربەرزی

عزاءٌ صبرٌ على المُصاب : ئارامگرتن لەسەر ناخۆشی ، سەبرگرتن

عزب لمْ يتزوّج : سەڵت بوو

عُزْفٌ حمامٌ بريٌّ : کۆترە کێوی ، کوکوختی

عزَف صوَّت ، غنّى : دەنگی لێوەهات ، گۆرانی وت

عزفَ نفسهُ عن كذا ، منعها عنه : لەخۆی گرتەوە

عزْفٌ على آلةٍ موسيقيّة : ژەنین

عزَق أسرع في العدْو ، اخفى ، شقَّ ، اخرج : خێرا دوژمنی کوتی ، شاردییەوە ، قڵیشاندی ، دەریهێنا

عُزْلةٌ إبتعاد عن الدنيا والناس : دوورە پەرێزی لە دونیاو خەڵکی

عزم وطّن النّفس ، جدَّ : خۆی ئامادەکرد ، سوور بوو

عزم على فعل كذا ، عقد نيّته على فعْلِهِ : نیازی کرد

عزى الشيء إلى فلانٍ ، نسبهُ إليه : پەهی ئەوی دانا

عَزّى دعا إلى الصبر ؛ داوای ئارامیی لێ کرد ، بەشداری پرسەی کرد

عَزِيزٌ (ج اعِزّاء) محبوبٌ قويٌّ غالب ، من أسماء الله الحسنى : خۆشەویست ، بەهێزی زاڵ ، ناوێکی جوانی پەروەردگارە

عَزِيمَةٌ (ج عَزائم) إرادة،ما عُقدت النيّة على فعله : ویست، نیازی کردار، ئیرادە

عَسْجَدٌ ذهبٌ : زێڕ ، ئاڵتون

عَسَرَ إشتدَّ ، خالف : سەخت بوو ، پێچەوانەی کرد

عَسِرَ يعمل بيدِهِ اليُسرى : دەستی چەپە بەکاردێنێت

عَسَّرَ عليه ، ضيّق ، خالف : تەنگی پێ هەڵچنی ، پێچەوانەی کرد

عسّر الأمرَ ، جعله عَسِراً : کارەکەی قورس کرد

عُسْرٌ قلّة ذات اليد ، فقرٌ : دەست کورتی ، هەژاری

عَسِرٌ صَعبٌ ، شديد : سەخت ، نارەحەتی

عَسَسٌ من يطوفون بالليل يحرسون الناس ويكشفون اللُّصوص:پاسەوانی شەو



عَسْفٌ ظُلْمٌ ، جوْرٌ : جەور ستەم

عَسَفَ الحاكم ، ظلم : ستەمی کرد

عَسَفَ الشّيءَ ، أخذهُ بقوّة : بەزۆر بردی

عَسَفَ الطريق ، حاد عنه : لەرێ لایدا

عَسْكَرٌ (ج عساكر) جيشٌ ، جنود : سەرباز

عَسَّلَ الطعام ، خلطهُ بالعسل ، عسُلَ الشيءُ ، صار كالعسل : هەنگوینی تێکەڵ بەخۆراکەکە کرد ، وەك هەنگوینی لێهات

عسلٌ(ج اعْسال وعُسْل)وعُسُل مادّة سُكّريّة تصنعها النّحل من الأزهار:هەنگوین

عُسْلُج (ج عسالج) مالانَ من اغصان الشجرة : لق و چڵی نەرمی درەخت

عسليٌّ ماكان بلون العسل : رەنگ هەنگوینیی

عسى كاد : رەنگە ، لەوانەیە

عسِرٌ صعْبٌ ، شديد ، قاسٍ : سەخت ، دژوار

عشٌ مسكنُ الطائر ، وكرٌ : هێلانە

عشٌّ نحِل : لەڕ بوو

عشٌّ عطاءٌ قليلٌ : بەخشینێکی کەم

عشا ساء بصره بالليل، عشا فلانا، قصده : شەو کوێر بوو، مەبەستی ئەوی کرد

عشا الضَيْف ، أطعمه العشاء : نانی ئێوارەی دا بە میوانەکە

عشاءٌ (ج أعْشية) طعام المساء: شیوژەمی ئێوارە



عشبَ نبت عُشبه : گژو گیا ڕوا

عُشْبَةٌ واحدة عُشْب : جلەگیا

عُشْر (ج عشُور واعشار) جزء من عشرة: دەیەك

عشْرَةٌ مخالطة ، صحبة : تێکەڵی ، هاوڕێیەتی

عشّى الضَيف ، أطعمه العشاء : ژەمی ئێوارەی دا بە میوان

عشيَ ساء بصرهُ ليلاً : شەو کوێر بوو

عشي العشاء ، أكله : نانی ئێوارەی خوارد

عشيَّةٌ (ج عشايا وعشيّ) أوّل ظلام الليل،عشاء: سەرەتای تاریکی شەو، خەوتنان

عشيرٌ (ج عُشراء) مُعاشر ، قريب ، صديق ، زوج ، زوجة : دۆست، خزم، برادەر، مێرد، ژن

عشيرةٌ (عشائر) قبيلة : هۆز ، عەشیرەت ، بنەماڵە

عشيقٌ عاشقٌ ، معْشوق ، محبوبٌ : یار ، دڵدار ، خۆشەویست

عصا الرجل ، ضربه بالعصا : بەدار لێیدا

عِصابةٌ (ج عَصائِب و عصابات) عِمامة ، جماعة من الناس أو الخيل أو الطير : **مێزەر ، کۆمەڵێك لە خەڵکی و ئەسپ و باڵندە**

عِصارٌ غبار شديد ، حينٌ : **خۆڵبارین ، تەپ و تۆزی زۆر ، کات**

عصَّارةٌ آلة تُعصر بها الفاكهة تدار باليد أو بالكهرباء : **ئامێری گوشینی میوە**

عِصامٌ (ج أعْصِمة وعُصُم) عروة ، عهدٌ ، حبلٌ : **دەسك ، پەیمان ، پەت**

عصاميٌّ منْ شرُف بنفسه لا بآبائِهِ: **ئەو کەسەی خۆی هەوڵی داو گەیشتەئامانج**

عَصَبٌ : **دەمار**

عصَبَ الشيء. شدَّه. طواه. عصب القطن عزله : **بەستی، پێچایەوە، لۆکەی ڕست**

عَصَبَ القومُ ، اجتمعوا و أحاطوابه : **لەدەوری کۆبوونەوە**

عَصَبِيٌّ مَن يغضب لعُصبته ويُحامي عليهم : **زوو هەڵچوو ، تووڕە**

عَصَبِيَّةٌ شدة إرتباط المرء بجماعته والمدافعة عنهم : **دەمارگیر**

عصْرٌ (ج عُصور واعْصُر) دهرٌ ، حقبةٌ من الزَّمن ، آخر النهار إلى احمرار الشمس ، **سەردەم ، سەردەمێك ، کاتی عەسر ، ئێوارە**

عصر الشيء ، إستخرج ما فيه من دُهْنٍ أو ماء : **گوشی ، ئاو یان ڕۆنی لێ گرت و دەرهێنا**

عصَر الشيء ، عصره مرّةً بعدأخرى،نبت،ادرك: **جار لەدوای جار گوشی،ڕوا، زانی**

عصْرِيٌ منسوب إلى عصر : **سەردەمی ، هاوچەرخ**

عُصْعُوص(ج عصاعيص) عظْم صغير في نهاية العمود الفقري .أصلُ الذنب : **کلێنجە ، ئێسکێکی بچوکە لە کۆتایی بڕ بڕەی پشت**

عُصْفُورٌ (ج عصافير) طائر صغير مُغَرِّد : **چۆلەکە ، چێشکە ، باڵندە**

عِصْمةٌ (ج عِصم و أعْصُم) مَنْعٌ ، ملكةٌ الهيّة تمنع من ارتكاب المعاصي : **قەدەغەکردن بەهرەیەکی خواییە لە گوناە کردن دەتپارێزێ (مەعسوم)**

عصمة قلادة : **ملوانکە ، خەناوکە**

عصى  خرج عن الطاّعة وعاند  :  **بەگوێ نەکرد و لاساریکرد**

عصْيانٌ عدمُ الإنقياد والطاعة  :  **گوێڕایەڵی نەکردن ، یاخی بوون**

عصيبٌ (ج عُصُبٍ و أعْصِبة) شديدٌ ، عسيرٌ  :  **سەخت ،  دژوار**

عُصيَّةٌ  عصا صغيرةٌ  :  **دارێکی بچوک**

عصيرٌ  مايُستخرج من الشيء المعصور  :  **گوشراو ، شەربەت**

عضٌّ (ج أعضاض وعُضُوض) سيّء الخُلق ، شرسٌ ، خبثٌ  :  **بەدڕەوشت  ، شەڕانگێر ، پیس**

عَضٌّ  شعيرٌ ، ما يبس من الحشيش  :  **جۆ ، پووش و پەلاش**

عُضالٌ  شديد ، مرضٌ عُضال  :  **دەردی گران ، نەخۆشییەکی گرانوبەئازار**

عضب  المرض ، اقعده عن الحركة  :  **نەخۆشیەکە لە جوڵەی خست**

عضب  عنه ، رجع  :  **گەڕاوە**

عضُدٌ (ج أعْضاد واعْضُد) ساعدٌ، مُعين، ناحيةٌ  :  **قۆڵ ، یارمەتیدەر، لا ، تەنیشت**

عضلٌ  (ج عضْلان) جُرذٌ  :  **جورج**

عضّل عليه ، ضيَّق عليه  :  **تەنگی پێ هەڵچنی**

عضَلت الأرض بأهلها،ضاقت بهم لكثرتهم:  **زەوییان پڕکرد،مرۆڤ زەوی پڕ کرد**

عُضْلةٌ  (ج عُضَل و عُضل) داهيّة  :  **مەینەتی**

عضلةٌ  (ج عُضل و عضلات) مجموعة الياف لحميّةٌ تتحرّك إرادياً او لا إرادياً  :  **ماسولکە**

عضَهُ  امْسكه بأسنانه  :  **بەددان گرتی ، گەززەی لێ گرت**

عضَه الزّمانُ ، اشتدّ عليه  :  **ڕۆژگار لەسەری قورس کرد**

عُضوٌ (ج أعْضاء) كلّ جزء من مجموع  :  **ئەندام**

عَطّارٌ  بائعُ العطر والأعشاب الطبيعيّة :  بۆن و عەتر فرۆش ، گیاو دەرمانی سروشتی فرۆش ، بەهارات فرۆش

عُطارِد كوكب سيّار ، وهو أقرب الكواكب إلى الشمس :  هەسارەیەکی گەڕۆکە ، نزیکترین هەسارەی گەڕۆکە لە خۆرەوە

عطبَ  هلكَ : لەناو چوو

عطب عليه ، عطب الفرسُ ، انكسر :  تێك شكا

عَطِرَ  طيِّب بالعطر :  بۆنی خۆشی لەخۆیدا

عِطْرٌ  ( ج عُطُور) طيبٌ ، نبات طيِّب الرائحة : بۆن ، گوڵاو ، ڕووەکی بۆن خۆش

عَطَسَ  أتتْه العطسة :  پژمی

عَطْسة  اندفاع الهواء بقوّة من الأنف مع صوت :  پژمین

عَطِشَ  ظمئَ ، إحتاج ، اشتاق :  تینووی بوو ، پێویستی بوو ، بیری کرد

عطف إليه ، مال :  بۆی لادا

عَطفَ عنه ، انْصرف :  وازی لێ هێنا

عطفَ عليه ، حنّ :     بەزەیی پیاهاتەوە

عُطْلَةٌ بقاءٌ من غير عمل ، إستراحة ، فرصةٌ :  بێ کارو بێ ئیش ، پشوو ، هەل

عطوفٌ (ج عُطْف) شفُوقٌ ، حنونٌ : بە بەزەیی ، بەسۆز

عطيّةٌ (ج عطايا و عطيّات) ما يُعطى :   بەخشش

عظةٌ (ج عظات) تذكير بالثّواب والعقاب ، نصيحة :  بە بیرهێنانەوەی پاداشت و سزا ، ئامۆژگاری

عظُم  كبُر :  گەورە بوو

عظم عليه الأمرُ ، صعُب وشقّ :  کارەکە قورس و گران بوو لەسەری



عظْمٌ (ج اعْظُم و عظام) قصب الحيوان والإنسان الذي عليها اللحم : ئێسقان

عظُم (فخُم . كبُر . بجُل) : گەورەی کرد

عظَمةٌ (ج عَظمات) زهوٌ ، كبرياء : روح گەورە ، لووت بەرز

عظْميٌّ نسبة إلى العظْم ، حمام يميل لونها إلى البياض : ئێسقانیی ، کۆترێکی مەیلەو سپی یە

عظيمٌ (ج عُظماء وعظام وعُظُم) كبير : گەورە

عظيمةٌ (ج عظائم) مُصيبة شديدة : بەلای گەورەو مەزن

عفَّ كفَّ : دەست بەرداری بوو

عفا صفح ، محا الذنوب : لێی بووری ، خوا لە گوناهی خۆش بوو

عفا الأثرُ ، زالَ وامّحى : شوێنەواری سڕییەوەو نەیهێشت

عفا الشيء ، خفي : بەنها ن بوو

عفّةُ ترك الأفعال الدنيئة ، طهارة الجسد: وازهێنان لە کردەوەی خراپ ، پاکیی

عفريتٌ (ج عفاريت) مُنْكر ، خبيث ، نافذٌ في الأمر مع دهاء : بێ ئەمەك ، پیس ، عفریت

عفْصٌ نوع من شجر البلُّوط : مازوو ، سەربەڕوو

عفنٌ مادّة فطريّة تنمو على بعض الأشياء الفاسدة بسبب الرطوبة : کەڕوو

عفِنَ فسد ، تغيّرت رائحتهُ : خراپ بوو ، بۆگەنی بوو

عفْوٌ (ج عفاء اعفاء) معروفٌ وفضلٌ ، صفحٌ : ناسراو بە چاکە ، لێبووردن

عفَى الأثر ، ازالهُ : شوێنەواری سڕییەوە

عفَى على ماكان فيه ، جاء بالصلاح بعد الفساد : چاکەی کرد پاش خراپە

عفيفٌ (ج اعفّة واعفّاء) ذو عفّة وطهارة : پاك و خاوێن

عقّ الثوب ، شقّه : **جلەكەی دڕاند**

عقّ والديْه ، عصاها وترك الإحسان إليها : **بەقسەی دایك و باوكی نەكرد و لەچاكەیان دەرچوو**

عُقابٌ (ج عِقبان و اعقُب) طائر من الجوارح قويّ المخالب اعقف المنقار حادّ البصر : **داڵ ، باڵندەیەكی ڕنۆكە بەهێزەو دەنووكی قولاپییەو گۆشت خۆرەو چاوی تیژە**

عِقابٌ جزاءٌ بالشرّ ، قِصاصٌ : **سزا ، تۆڵە**

عُقارٌ خمرٌ : **شەراب ، عارەق**

عقّارٌ (عقاقير) ما يتداوى به من النبات : **دەرمانی گیایی**

عقارٌ (ج عقارات) منزلٌ ، ارضٌ ، ضيْعةٌ : **خانووبەرە ، زەوی و زار**

عَقارةٌ عُقمٌ ، عدمُ الانجاب : **نەزۆكی**

عِقالٌ (ج عُقل) حبلٌ يُشدّ به الحبل في وسط ذراعه : **ئەو پەتەی وشتری پێ دەبەسترێتەوە**



عِقال حلْقٌ حبْلٍ يضعُ العربُ على راسه: **عەگالی عەرەبان**

عُقّالٌ داءٌ يُصيب ارجل الدوابّ تنقبض منه العضلات : **گۆچی ئاژەڵ**

عقبٌ(ج أعقاب)عصبٌ تُعمل منهُ الأوتار: **دەمارێكە دەنگە ژێ كانی پێ كاردەكات**

عقبٌ (ج أعقاب) عظم مؤخّر القدم ، اخر كلّ شيءٍ : **پاژنەی پێ ، كۆتایی هەموو شتێك**

عُقبةٌ (ج عُقب) نوبة ، بدل : **نۆرە ، لەبری**

عقبةٌ (ج عُقود)حلية من خرز او جوهر يُنظم في خيط تُحيط بالعنق ، قلادةٌ: **گەردانە ، ملوانكە**

عقَد اليمينَ ، عقدها ، انفذها : سوێندی خوارد ، سوێندەکەی جێبەجێ کرد

عقد الحبْل ، بالغ فی عقدِه : پەتەکەی بەتوندی گرێدا

عقد الكلام ، عمّاه : قسەی ئاڵۆزو پڕ گرێی کرد

عقد الخيْط ، جعل فيه عُقْدة : گرێ ی لەداوەکەدا

عقد البيْع والْعهْد،اكّدهُ : کڕین و فرۆشتنەکەی چەسپاندو پەیمانەکەی دووپات کردەوە

عقد الشّيءُ ، إلتوى كانَ فيه عُقْدة ، عقدلسانهُ إحتبس : شتەکەی لوول کرد وەك گرێ ی تێدا بێ ، زمانی گیرا

عقْدٌ (ج عُقُود واعْقاد) عهْدٌ ، إتّفاق : پەیمان ، ڕێککەوتن

عُقْدةٌ (ج عُقد) موضع العقدْ ، ولاية ، مشكلة ، ازمة : شوێنی گرێ ، سەرکردایەتی ، کێشە ، قەیران

عقْرٌ اصْلُ كلّ شيء : بناغەی هەموو شتێك

عقرَ الحيوانَ ، ذبحه : سەری بڕی

عقر الكلبُ الولد ، عضّه : سەگ منداڵەکەی گەست

عقر النّخْلة ، قطعها من راسها : دار خورمای لەسەرەکەیەوە بڕی

عُقْرٌ (ج اعقار) خيار الكلأ : باشترین لەوەڕگا

عُقْر الدار ، وسطها : ناوەڕاستی خانوو

عقْربٌ (ج عقارب) دابّة صغيرة سامّة كثيرة الأنواع تلسع بأبرة في طرف ذنبها ، دووپشك

عقف الشيء ، لواهُ في طرفه : شتەکەی لەلایەکەوە خوارکردەوە

عقل ادرك حقائق الأشياء ، فهم : ئاقڵ بوو، تێ گەی

عقل إليه ، لجأ : پەنای بۆ برد

عقلٌ(ج عُقول)ماتدرك به النفسُ مالا تدركه بالحواس. قلبٌ، حصنٌ ، ملجأ :
ژیری ، دڵ ، قەڵا ، پەناگە

عُقْلَة (ج عُقل) رباط ، قيد ، عقالٌ :بەستەر

عقمَ الرّجلُ والمرأة ، لم ينجبا لمانع : ژن و پیاوەکە نەزۆك بوون

عُقُوبةٌ جزاءُ الشرّ ، قصاصٌ : سزا ، تۆڵە

عقيدةٌ (ج عقائد) ما عُقد عليه القلبُ والضمير ، اعتقاد: بیروباوەڕ ، باوەڕ

عقيقٌ (ج اعقّة) حجرٌ كريمٌ احمرُ تُصنع منه الفُصوصُ : بەردێکی سووری بەنرخە قاشی لێ دروست دەکرێ

عقيلةٌ (ج عقائل) كريمة : ژن ، هاوسەر

عقيم (ج عُقْم وعُقماء) إمراة او رجل لايُنجب : ژن و پیاوی نەزۆك

عقلٌ عقيمٌ ، لا خير فيه : عەقڵی نەزۆك ، بێ چارە

عُكّازٌ (ج عكازات) عصا يُتوكأُ عليها : دار شەق ، گۆچان

عكّر الماءَ ، صيّرهُ عكيراً أيْ غير صافٍ : ئاوەکەی لێڵ کرد

عكز على عُكّازته، توكأ عليها ، عكزالرُمح ، غرزه في الأرض : خۆیدا بەسەردار شەقەکەیدا ، ڕمەکەی لەزەوی دا چەقاند

عِكْزٌ بخيل : ڕەزیل ، قرچۆك ، پیسکە

عكس ضاق خُلقه : قیچکە تەنگ ، بێزاربوو

عكس الشيء ، قلبهُ : هەڵی گێڕایەوە

علا إرتفع ، علا في الأرض ، تحيّر وتكبّر : بەرز بۆوە ، زۆر داری کردو لووت بەرز بوو

علا ارتفع ، تكبّر وتجبّر : بەرز بۆوە ، لوت بەرز بوو و زۆر داری کرد

علاجٌ دواءٌ ، كل ما يُعالج به : دەرمان، چارەسەر

علاقةْ (ج علائق) ما تُعلق بهِ : ئەوەی شتی پێ هەڵدەواسرێ

علامةْ (ج علام وعلامات) امارة : نیشانە



علّامةٌ كثيرُ العلم : زۆر زانا ، دانا

علانيّةٌ ظهور : ئاشکرا

علاوة (ج علاوى وعلاويّ) زيادة : زیادە

علبة (ج علاب وعُلَب) صندوق : سندوق ، قوتو ، تەنەکە

علفٌ (ج اعلاف وعلاف) طعام الحيوانات : ئالیك

علقَ الشيْءُ بالشيْءِ ، نشب فيه : شتێکی بەشتێکە وە بەستەوە

علقٌ دودٌ اسودُ يمتصُ دم الإنسان : زەروو ، کرمێکی ڕەشی دەم تیژە خوێنی مرۆڤ دەمژێ

علقمٌ كل شيء مُر : هەموو شتێکی تاڵ

علك مضغ : جووی

العلْكُ كل صمغ يعلَكُ فلا ينوبُ : بنێشت

علم (ج اعْلام) راية ، سيّد القوم ، منارة : ئاڵا ، گەورەی هۆز ، بەیداغ

علم علامة : نیشانە

علم عرف : زانی

علْم (ج عُلوم) معرفة : زانست ، زانین

علْمانيٌ، لاديني : عەلمانی ، ئاناینی ، بێ دینی ، سکیولاریزم

علن ظهر ، انتشر : ئاشکرا بوو ، بلاّوبۆوە

عُلُوّ ارتفاع : بەرزی

على حرف جرّ : لەسەر

عليٌّ (ج عليُّون وعلية) مرتفعٌ ، صلب قويّ ، رفيع القدْر : **بەرز ، ڕەق و بەهێز، پایە بەرز**

عَلياء شَرفٌ ، كلّ شيء مرتفع : **ئابڕوو ، هەموو شتێکی بەرز**

عُلَّيْقٌ نبتٌ شائك ثمره كثمر التّوت : **ڕووەکی توو دڕك**

عَليلٌ (ج أعلاّء) مريضٌ : **نەخۆش ، ناساغ**



عليم (ج عُلماء) عالمٌ مُتَّصفٌ بالعلم العميق ، من أسماء الله الحسنى:**زانا،شارەزا،ناوێکی جوانی پەروەردگارە**

عَمَّ اصبحَ عمّاً : **بووە مام**

عَمَّ المطرُ الأرض عموماً ، شملها : **بارانەکە هەموو زەوی گرتەوە**

عمٌّ (ج أعمام وعُمُومة) شقيق الوالد ، جماعة كثيرة : **مام ، کۆمەڵێکی زۆر**

عمٍ (ج عمُون) من ذهب بصرهُ ، جاهل ، أعمى : **نابینا ، نەزان ، کوێر**

عِمادٌ(ج عُمُد وعمد) ابنية عالية ، مايُسْنَد بهِ ، رئيس العسكر : **کۆشکی بەرز ، کۆڵەکە ، پلەی سەرهەنگ**

عِمادةٌ منصب العميد في كلّيّات الجامعات : **پلەی ڕاگر لە کۆلێژەکانی زانکۆدا**

عِمارةٌ بُنيانٌ : **باڵاخانە ، ساختمان**

عِمالة راتب ، ما يتقاضاه العامل من مال : **مووچەیکرێی کرێکار ، مەعاش**

عِمامةٌ (ج عمائم وعِمام) ما يُلفُّ على الرأس : **مێزەر ، مەندیل**

عمّةٌ شقيقة الوالد : **پووری خوشکی باوك ، پلك**

عمّد سدٌ ، غسل (النّصرانيُّ) الطفل عند ولادته : **داپەست ، لای دیانەکان لەکاتی لەدایکبوون منداڵەکەی لەناو هەڵدەکێشن ، تەرکردن**

عمد قصد ، ذهب ، اسقط : **بە مەبەستی ، ڕۆیشت ، خستی**

عَمَدٌ شابٌ ممتلئٌ شباباً : **گەنج ، لاو**

عُمْدةٌ (ج عُمَد) ما يُعتمد عليه ، رئيس العسكر : **ئەوەی پشتی پێ دەبەسترێ ، سەرهەنگ ، گەورەی گوند**

عمر ربَّهُ عَبده، صامَ ، وصلَّى : **خوای خۆی پەرستپرۆژووی گرت و نوێژی کرد**

عمر الرجل ، عاش زمناً طويلاً : **تەمەنێکی زۆر ژیا**

عمر المنزل ، سكنه : **لەماڵەکەدا ژیا**

عمر بالمكان ، أقام : **تیا نیشتە جێ بوو**

عمُر المالُ ، صار كثيراً : **ماڵەکە زۆر بوو**

عُمْرانٌ بُنْيانٌ ، ما يُعمر به البلدُ و يُحَسِّنُ حالهُ : **ئاوەدانی**

عُمْرةٌ (ج عُمَر وعُمُرات) نُسُكٌ كالحجِّ ليس له وقتٌ معيَّنٌ و لا وقوفٌ بعرفة : **عومرە (وەکو حەج وایە ، هەموو کات دەکرێ ، وەستانی لەعەرەفەی تێدانیە)**

عمَش عن الشيء ، تغافل عنه : **خۆی لێ بێ ئاگا کرد**

عمشت عنهُ ، ضعُف بصرها : **چاوی کزبوو**

عمش الولدَ ، ختَنهُ : **منداڵەکەی خەتەنە کرد**

عمُقت البئر ، بعُد قعْرُها : **بنی بیرەکە قووڵ بوو**

عمُق المكانُ ، بعُد : **شوێنەکە دووربوو**

عملٌ (ج أعْمال) فعلٌ بقصدٍ ، مهنةٌ ، حرفةٌ : **کردار ، پیشە ، کار**

عمل صنع ، فعل فعلاً عن قصد : **دروستی کرد ، کردی**

عمليٌّ منسوب إلى عمل ، واقعيٌّ : **کردارەکی ، ڕاستێتی ، پراکتیکی**

عممٌ كثرةٌ ، تامٌّ عام من كلّ أمْر : **زۆری ، تەواو و گشتی هەموو شتێك**

عمه تحيَّر وتردّد في الطريق ، لم يدْر أين يذهب : **سەرگەردان و سەراسیمەی ڕێگابوو ، نەیزانی بۆ کوێ بچێ**

عمُودٌ(ج أعْمدة وعُمُد وعمد)ما يقوم عليه البناء،سيِّدٌ : **ستوونی خانوو، گەورە**

عمىً ذهاب البصر : نابینایی

عمى السحابُ، سالَ، الموجُ ، رمى بالزَّبد: هەورەکە باری، شەپۆلەکە کەفی فڕێدا

عمِيَ ذهب بصرُهُ كلّه : کوێر بوو

عميَ عن الشيء ، لم تهتد إليه : ڕێگا چارەی نەدۆزییەوە

عميدٌ (ج عُمداء) رئيس كليّة أو جامعة ، رتبة عسكرية ، ڕاگری کۆلێژو زانکۆ ، پلەیەکی سەربازی (سەرهەنگ)

عميقٌ(ج عمق وعُمُق وعماق)بعيدُ القعر،مُنبسطٌ وطويلٌ: قووڵ،ڕاخراو و درێژ

عميلٌ (ج عُملاء) مُتعاملٌ مع غيره في التّجارة ، جاسوس : ئەوەی بازرگانی لەگەڵ کەسێکی تردا دەکات ، سیخوڕ

عميمٌ (ج عُمُم) كلّ ما اجتمع وكثُر : هەمووی کۆبۆوە ، زۆر بوو

عنْ حرف جرّ : له

عنّ ظهر ،جعل، حبس،سبَّ : ئاشکرا بوو ، وایکرد ، بەندبوو ، جنێوی دا

عناءٌ تعبٌ ومشقّةٌ : ماندووبوون و شەکەتی

عُنّابٌ شجرٌ حبّه كحبّ الزّيتون اجوَدُهُ الأحمر ثمره حلو الطّعم : میوەی سنجوو وەکو (گێلاس)ە

عناقٌ شدّةٌ و خيبةٌ : کەساسی و نائومێدی

عنانٌ سحاب : هەور

عنانُ السماء ، يبدو منها للنّاظر إليها : ئاسمان

عنانٌ (ج أعنة وعُنُن) سير اللّجام الذي تُمسك به الدّابة : جڵەوی ئاژەڵ

عنايةٌ إهتمام ، رعاية : گرنگی ، چاودێری

عنبٌ (ج أعناب) ثمر الكرْم : ترێ



عنبرٌ (ج عنابر) مادةٌ صلبة تُستخرجُ من الحوت تنبعث منها رائحة ذكية إذا أُحرقت:بۆنی عەنبەر

عنبر جنسٌ من الحيتان ، طيبٌ : (عەنبەر) ، جۆرە نەهەنگێکە ، بۆنی خۆش

عنت فسد ، أذنب ، وقع في ضيق : خراپەی کرد ، تاوانی کرد، کەوتە تەنگانەوە

عند ظرفُ المكان والزمان ، الحضور : لەتەك ، لەکاتی ئێستادا

عندَ ليبٌ (ج عنادل) طائر صغير حسن الصوت : بولبول ، شالوور

عنزةٌ (أنثى الماعز والظباء والأوعال) : بزنە مێ و ئاسك و بزنە کێوی

عنزةٌ (ج عنز و عنزات) عصا في أسفليها زُجُّ : گۆچانێکخوارەوە ئاسنە

عنزةُ الفأس ، حدُّها : ڕووە تیژەکەی تەورداس

عُنصرٌ (ج عناصر) أصلٌ و حسبٌ ، همّة ، جنسٌ : ئەسڵ زادەو وەچاخ زادەیی ، خواست و ویست ، ڕەگەز

عُنصر ماتكونُ منهُ المادة : توخم ئەوەی ماددەی لێ پێکدێت

عنصرةٌ عيدٌ عند اليهود والنصاري : جەژنێکی جولەکەو گاورەکانە

عُنصُريٌّ نسبة إلى عُنصر ، متعصّب لجنسهِ : توخمی ، ڕەگەز پەرست

عُنصُريةٌ مذهب المتعصّبين لجنسهم : ڕێبازی ڕەگەز پەرستی

عُنفٌ شدّةٌ ، قسوةٌ : توندوتیژی

عنقاءُ مصيبةٌ ، طائرٌ خيالي لا وجودَ له : کارەسات، بالندەیەکی ئەفسانەیی یە

عُنقودٌ (ج عناقيد) ما إجتمع وتراكم من الحبُّ في غصن واحد : هێشوو

عنكبُوتٌ (ج عناكب و عنكبُونات)حشرةٌ تنسج من لعابها نسيجاً رقيقاً مُهلهلاً تصيدُ به طعامَها ، جاڵجاڵۆکە ، داپیرۆچکە

عُنوانٌ سمةٌ ، ما يُستدلُّ بهِ على مضمون الشيء : نیشانە ، ناونیشان

عنون الكتابَ ، كتب عنوانَه : ناونیشانی کتێبەکەی نووسی

عَنَى بكلامه كذا ، أرادهُ ، قصدهُ : ویستی ، مەبەستی بوو

عَنِيَ تَعِبَ : ماندوو بوو

عُنِيَ بالأمرِ : إشتغل ، إهتمَّ به : سەرقاڵ بوو پێوەی ، گرنگی پێدا

عَنِيدٌ (ج عُنُد) من يخالف الحقَّ ويردُّه وهو يعرفه : لاسار ، کەللە ڕەق

عنيفٌ (ج عُنُف) شديدُ القسوة : توندو تیژو بەزەبر

عَهْدٌ (ج عُهُود) وفاء، أمان، مودَّة ، ميثاق : وەفا، دڵنیایی، خۆشەویستی ، پەیمان

عَهِدَ الشَّيءِ ، حَفِظَهُ ورعاهُ ، أوصاهُ أو عزَ إليه به : شتەکەی پاراست و چاودێری کرد ، ڕای سپاردو بیپارێزێ

عَهَرَ زنى : زیناى کرد

عَوَّاءٌ كلبٌ يَعوي كثيراً : سەگی زۆر وەڕ

عوادٌ لُطفٌ ، برٌ : سۆزو بەزەیی ، کاری چاکە

عَوَّامٌ سَبَّاح ، فَرسٌ سابحٌ في جَرْيِه : مەلەوان ، ئەسپی تیژڕەو لەغار غارێندا

عَوانٌ (ج عُون) ارضٌ مطمورة ، حرب شديدة : زەویەکی شاراوە ، جەنگی توند ، ناوەڕاست

عَوِجٌ إلتواء : خواری

عَوَّجَ العُودَ ونحوهُ ، حنَّاهُ : خواری کردەوە

عَوِجَ إنحنى ، ساءَ خُلُقَه : خواربۆوە ، بەد ڕەوشت بوو

عَوَّدَ أسنَّ : بەساڵاچوو ، پیربوو

عَوَّده الشيءَ ، جعله يعتادُهُ : وایکرد خووی پێوە بگرێ

عُودٌ (ج عيدان وأعواد) قطعُ خشب

وعُود ، آلة موسيقيّة جوفاء ذات أوتار



: داری باریك (داروچکە) ، ئامێرێکی مۆسیقای ژێ دارە (عود)

عوْدٌ (ج عودة) طريق قديم : ڕێگای کۆن

عوْذُ مَلْجَأ : پەناگە

عور ذهب بصر احدى عينيه : یەك چاوی کوێر بوو ، خێل بوو

عوّر عليه فعْله ، قبّحهُ : خراپ و نالەباری

عوْرةٌ (ج عوْرات و عورات)كلّ امر يُستحيا منه مما يمتنعُ إظهاره من الجسد ، هەموو کارێکی شەرمنانە ، شەرمگە ، ئەو ئەندامەی لەش نابێ دەرکەوێ

عوْسجٌ شجرٌ شائك الأغصان : تووڕك ، تووترك

عوص صعْب : سەخت بوو

عوضٌ (ج اعْواض) خلفٌ ، بدلٌ : بریکار، لەجیاتی ، قەرەبوو

عوّق أخّر ، ثبّط : دواپخست ، تەگەرەی لێ خست

عوْقوعُوقٌ (ج أعواق) عائق : کۆسپ و تەگەرە

عوّل رفع صوته بالبكاء والصياح : دایە پرمەی گریان و بەکوڵ گریا

عوّل عليه ، اعتمد عليه اتّكل : پشتی پێ بەست

عوّم الشيء جعله يعوم : مەلەی پێ کرد

عوْنٌ مساعدة ، خادمٌ ، مُساعدٌ : یارمەتی دان ، خزمەتکار ، یارمەتیدەر

عوى الكلْبُ او الذّئْبُ ، لوى خطْمَهُ ثمّ مدّ صوْتَهُ : سەگ و گورگ (لوراندیان)

عويصٌ صعبٌ ، مُبهمٌ : گران ، ئاڵۆز

عويلٌ رفْعُ الصوت بالبكاء والصّياح : دەنگ بەرزکردنەوە بەگریانو شیوەنڕۆڕۆ

عيّ بأمره ، عجز عنه : بۆی ئەنجام نەدرا

عياءٌ عجْزٌ ، تعبٌ : نەتوانین ، هیلاکی

عيادةٌ مكان يستقبل فيه الطّبيب مرضاه : کلینیکی پزیشکی ، نۆرینگە

عِيادٌ ملجأ : **پەناگە**

عِيارٌ (ج عيارات) ما جُعل أساساً لتقدير الأشياء من كيل أو وزن : **هەر شتێك ئەندازە گیری پێ ئەنجام بدرێت لە سەنگ و پێوا**

عِيارٌ طلقٌ ناري : **گوللە**

عِيانٌ (ج عُيُن و أعْيِنة) شَخصٌ : **كەس**

عَيَّبَ انتقص : **ناتەواوی كرد ، عەیبداری كرد**

عَيَّدَ شهد العيد : **جەژنی كرد**

عِيدٌ (ج أعْياد) يوم يُحْتَفلُ فيه بتذكارٍ لذي فضْل أو حَدثٍ وطنيٍّ أو ديني : **جەژن ، یاد**

عَيَّرَ قبّح فعله : **پیاو هەڵشاخا لەسەر كردەوەی ، كارەكەی بەناشیرین دانا**

عَيْشٌ حياةٌ ، خُبزٌ ، طعامٌ ، زرْعٌ : **ژیان ، نان ، خۆراك ، كشتوكاڵ**

عَيَّطَ صاح : **هاواری كرد**

عَيِطَ الرجل ، كانت عُنقه طويلةً : **ملی درێژ بوو**

عَيَّلَ كثُر عيالُهُ : **ماڵ و مناڵی زۆر بوو**

عَيَّلَ فرسه ، أهمله : **ئەسپەكەی وەلاوەنا ، فەرامۆشی كرد**

عَيْلَةُ الرجل ، عائلتُهُ : **ماڵ و منداڵەكەی**



عَيْنٌ (ج أعْيُن و عُيُون) حاسّةُ البصر : **هەستی بینین ، چاو**

عَيْنٌ ينبوع ماء ، جاسوس : **سیخور ، كانی**

عين جماعة : **كۆمەڵێك**

عينٌ إتّساع العيْن ، **چاوگەورە**

عينٌ أهل البلد : **خەلكی ولات**

عيّن الشيء ، خصّصهُ . عيّن الحربَ بيْنهُم ، أدارها : **شتەكەی تەرخان كرد ، شەرەكەی بەڕێوە برد**

عيّن فلاناً و ظيفته . قلّدهُ إيّاها : **لەسەر كار دايمەزراند**

عيْنةً (ج عيّنات) نموذجٌ من مادّة أو بضاعة : **نمونەيەك لە ماددەو كەل و پەل**

عينةُ (ج عين) خيارُ الشّيء : **باشترينشت ، نمونە**

عييٌ (ج أعْيياء و أعْيِيةُ) عاجزٌ كالٌ : **پەككەوتەو ماندوو ، شەكەت**

عيي جهل . عجز . لم يهتد لمراده : **نەزان بوو ، پەكی كەوت ، بە مەبەستەت نەگەيی ، بە مرازی نەگەيشت**




## بابُ الغين ، بەشی پیتی (غەین)

غ الحرف التاسع عشر من حروف الهجاء : **پیتی نۆزدەهەمە لە ڕیز بەندی پیتە هیجائییەکان**

غائبٌ (ج غائبون)ضدّ حاضرٌ : **ئائامادە**

غائِطٌ (ج غوط) براز ، تَبَرُّزٌ : **پیسایی ، گو ، پیسایی کردن**



غابَ سافر ، غَرُبَ ، استتَر عن العيْن ، خفي : **سەفەری کرد ، ئاوابوو ، لەبەرچاو ون بوو ، بزر بوو**

غابةٌ (ج غابات) أرض واسعة ذات شجر كثير : **دارستان**

غابِرٌ (ج غبْر ، غابرُون) ماضٍ : **ڕابردوو**

غادةٌ (ج غيد ، غادات ) إمرأة ناعمة ليِّنة: **ئافرەتی نەرم و ناسک و جوان**

غادِرٌ (ج غادِرُون و غدرة و غدَّار) خائن ، ناقض العهد : **ناپاك ، پەیمان شکێن**

**غارٌ** (ج أغْور و غيران) كهفٌ ، شجرٌ طيّب الرائحة: **ئەشکەوت،درەختێکی گەڵا بۆنخۆشە**

**غارَ** غَرُبَ ، غاب: **ئاوابوو ، بزربوو**

**غارَ الماءُ** ، ذهب في الأرض : **ئاوەکە بەناخی زەویدا ڕۆیشتە خوارەوە ، ئاوەکە ڕۆچوو**

**غارَةٌ** (ج غارات) نهْبٌ ، هجوم : **ڕاوڕوت ، هێرش ، تالأن**

**غازَلَ المرأة** ، حادثها وراودها : **قسەی لەگەڵ ئافرەت کردو دەوریدا ، قسەی لەگەڵ کردو لێ ی نزیك بووەوە**

**غاصَ في الماء** ، غطس و نزل فيه : **خۆی نقومی ئاو کرد و چووە ناویەوە**

**غاطِسٌ** مُظْلِمٌ ، منغمسٌ في الماء : **تاریك ، لە ئاودا نقوم بوو**

**غافِرٌ** (ج غُفّل و غُفُول) ساهٍ : **بێ ئاگا**

**غالِبٌ** (ج غلبة) مُنْتَصِرٌ ، مُنْهزم ، **سەرکەوتوو ، بەزیوو**

**غالِبيَّةٌ** أكثريّة : **زۆرینە**



**غالى** بالغ : **زیادەڕەوی کرد**

**غامَرَ** قاتل ، رمى بنفسه في الشّدائد : **جەنگی کرد ، خۆی خستە ناوکێشەکان**

**غامِضٌ** (ج غوامض) خفيٌّ ، مُبهمٌ : **شاراوە ، پەنهان**

**غايَةٌ** (ج غاي و غايات) مدًى ،نهاية ، رايةٌ ، فائدة مقصودة ، **ماوە ، کۆتامەبەست ، ئاڵا ، سودێکی مەبەستدار**

**غَبر** علاه الغبار، صار لون بلون الغبار:**تۆزی کەوتە سەر ڕەنگی تۆزو خۆڵی گرت**

**غَبَرَةٌ** غُبارٌ : **تۆزو خۆڵ**

غبْطةٌ  حُسن الحال ، مسرَّة ، لقب بطريرك عند النّصارى : **خۆشحاڵ ، شادمان ، نازناوی بەترپرکە لای دیانەکان**

غبيٌّ (ج اغْبياء و أغْباء) قليل الفطنة ، جاهل ، مُغفَّلٌ : **گەمژە ، نەزان ، زۆر بێ ئاگا ، گێل**

غثي الكلام ، خلطه : **قسەی تێکەڵ و پێکەڵ کرد**

غثي الوادي ، كثُر فيه الغثَاءُ : **دۆڵەکە پڕ لە کەف بوو**

غدا ذهب وقت الغداة : **سەر لەبەیانی کەوتە ڕێ**

غداةٌ (ج غدوات) ما بين الفجر وطلوع الشمس : **بەرەبەیان**

غدّارٌ  كثير الغدْر والخيانة : **زۆر ناپاك و خیانەتكار ، ستەمكار**

غدّة(ج غُدد و غدائد)جهاز يفرزُ المواد الضرورية في الدّم : **ڕژێن، ڕێژنەکانی لەش**

غدر الرجل به،خانه ونقض عهدهُ : **ناپاکی لەو پیاوە کردو پەیمانی نەبردە سەر**

غدّى اطعم الغداء : **ژەمی بەیانی دایە ، خواردی**

غديرٌ (ج غُدران و غُدُر و أغْدرة) نهرٌ صغيرٌ ، قطعةٌ من الماء يتركها السّيل: **ڕوباری بچوك، گۆماو**



غذاءٌ (ج أغْذية) ما ينمو به الجسم : **خۆراك**

غرّخدع : **فریوی دا**

غرّ الماءُ ، نضب : **ئاوەکە وشك بوو**

غراءٌ  طلاءٌ : **کەتیرە ، سمغ**

غرابٌ (ج اغْربة و غرْبان) طائرٌ أسودُ اللون : **قەلەڕەش**

غرامٌ  حُبٌّ ، عذاب دائم : **خۆشەویستی ، ئازاری بەردەوام**

غرْبٌ (ج غُروب) جهة غروب الشمس : **خۆرئاوا**

غَرَبَ ذهب ، غاب : **ڕۆیشت ، ئاوابوو**

غِرْبالٌ (ج غَرابيل) ما يُغَربلُ به ، دُفٌّ ، رجُلٌ نمّامٌ : **بێژینگ ، دەف ، دووزمان**

غُرْبَةٌ بُعْدٌ ، نزوح عن الوطن،بياضٌ خالصٌ : **دووركەوتنەوە ، ئاوارەیی ، تەواو سپی ، لانەوازیی**

غَرْبَلَ نخل : **لە بێژینگی دا**

غَرْبَلَ الشيء ، قطعه ، فرّقه : **شتەکەی بڕی،شتەکەی جیاکردەوە**

غَرَّدَ رفع الصوت في الغناء : **دەنگی بەرز کردەوە بۆ گۆرانی چرین**

غَرَزَ نخس: **پیاچەقا**

غرزَ عوداً في الأرض ، ادخلهُ فيها : **دارەکەی چەقان لە زەویدا**

غَرَسَ الشجر ، أثبتهُ في الارض : **داری چاند**

غُرْفَةٌ (ج غُرَف و غُرْفات)ما غرف من الماء وغيره،عُلّيّةٌ،حُجْرة : **مشتە ئاو و شتی تر ، ژوور**

غَرِقَ غار ، رسبَ : **نقوم بوو ، نیشت ، خنکا**

غَرَّقَ الشيء في الماء ، اغْرقهُ : **لە ئاودا نقومی کرد ، خنکاندنی**

غُرْمٌ مايجبُ أداؤهُ من المال: **پێ بژاردن بە پارەو سامان، پێویستە بدرێ، غەرامە**

غُرُوبٌ مغيب الشمس : **خۆر ئاوابوون**

غُرُورٌ اباطيل ، انخداعٌ : **لە خۆبایی بوون ، فریودان**

غريبٌ (ج غُرباء) بعيد عن وطنه ، اجنبيٌّ : **دوورە ولآت ، بێگانە ، لانەواز**

غريرٌ (ج أغرّة و اغرّاء) مغرور : **لە خۆبایی**

غريزةٌ (ج غرائز) طبيعة ، قريحةٌ : **سروشت ، بەهرە**

غريق (ج غرقى) غائر في الماء ، هالكٌ : **خنکاو ، فەوتاو ، نقوم بوو**

غريمٌ (ج غُرماء و غُرّام) دائن ، خصْمٌ : **قەرزدار ، دوژمن**

غزا العدوّ ، سار إلى محاربته وقتاله في دياره : هێرشی بردە سەر دوژمن

غزارة كثرة ، وفرة : زۆری ، دەوڵەمەندی

غزالٌ (ج غِزْلان و غِزْلة) حيوان لبون ذو قرون - شادنٌ : مامز ، ئاسك



غزل الصُّوف.مدَّهُ وفتلهُ خيطاناً بالمغزَ : خوری ڕست

غزيرٌ (ج غِزار) كثيرٌ ، وافرٌ : زۆر ، دەوڵەمەند

غسالة جهاز تغسيل الثوب : جل شۆر ، ئامێری جل شوشتن

غُسالةٌ ما يُغسلُ من الثوب ، ما يخرج منه بالغسل : جلی شۆراو ، ئاراو

غسَقٌ ظُلمة أوّل الليل : سەرەتای شەو

غسيل (ج غسْلى و غُسْلاء) مغْسُولٌ : شۆراو

غشٌ خيانة ، حِقدٌ و ضغينة : ناپاكی ، ڕق و كینە

غشم ظلمَ ظُلْماً شديداً : زۆر ستەمی كرد



غشّى غطّى : داپۆشی

غصَّ بالطّعام أو الماء ، اعْترض في حلْقِهِ شيءٌ منه فلم يكدْ يُسيغُه : خواردن یان خواردنەوەی لە قورگدا مایەوە

غصب قهر : زۆری لێ كرد

غُصّةٌ (ج غُصص و غصان) ما غصَّ به الإنسانُ : خەم و خەفەت

غُصْنٌ (ج غُصُون و أغْصان) ما تشعّب عن ساق الشجرة : لقی دار ، لق

غضبٌ غيظٌ : توڕەیی

غطَّ هدر : دەنگی دایەوە

غطاءٌ (ج أغْطية) سِترٌ يُغطّى به : سەرپۆش

غطّاسٌ الذي يُغطس في قعْر الماء : ئەوەی لە ژێر ئاودا دەگەڕێ ، مەلەوان



غطْرَسَ على فلانٍ ، تكبّر : فیزی نواند بەسەریدا

غطَسَ في الماء ، انغمسَ فيه : چووە ژێر ناو

غطَسَه في الماء ، غمسه فيه : نقومی ژێر ناوی کرد

غَطّى الشّيء ، سترهُ و أخفاه : دایپۆشی و شاردیەوە

غفا نعس ، نام نومةً خفيفةً : بۆرژاسووکە خەو گرتی

غِلٌّ حقدٌ و غشٌّ : کینەو فێل

غَلا تشدّد ، التفّ و عظم : توند بوو،لێی ئاڵا و گەورەبوو

غلا السّعر غلاءً ، ارتفع : نرخی بەرزبۆوە

غَلاءٌ (ج أغلية) ارتفاع الأسعار : بەرزبوونەوەی نرخەکان ، گرانیی بازاڕ

غِلافٌ (ج غُلف و غُلُف و غُلُف ) غشاءٌ : بەرگ

غُلامٌ (ج غِلمان و غِلمة و أغلمة) صبي ، شابٌّ : منداڵ ، مێر منداڵ ، هەرزەکار

غَلَبَ قهر ، تفوّق : زاڵ بوو ، بردییەوە

غَلَبَةٌ، قهْرٌ ، تفوُّق : زاڵبوون، بردنەوە

غَلّةٌ (ج غلاّت و غِلال) دخْلٌ من أجرة بيت أو فائدة أرض : داهات

غَلّطَ نسبهُ إلى الغلط : بەهەڵەی برد

غَلْطَةٌ (ج غلطات) المرّة من الغلط : هەڵەیەك

غَلُظَ صار غليظاً خشناً : ڕەق و زبر بوو

غَلَّف غطّى : دایپۆشی

غُلُوٌّ مُبالغة ، تشدُّدٌ : زیادەڕەوی ، توندو تیژی

غلى تتقلّب بأثر قوّة الحرارة : کوڵا

غليظٌ (ج غلاظٌ) خشنٌ ، شديدٌ ، صعْبٌ : زبر ، توند ، سەخت

غليلٌ (ج غلائلُ) عطشٌ ، غيْظٌ : تێنوێتی ، ڕەق و توندی



غلْيونٌ (ج غلايين)انبوب من خشب مجوّف له راس معقوف يُحرق فيه التبغ للتدخين : **دار جگەرە**

غمٌّ (ج غُمُوم) حُزْنٌ و كَرْبٌ : **خەم و خەفەت ، پەژارە**

غمامةٌ (ج غمائم و غمام) سحابةٌ : **هەور**

غِمْدٌ (ج غمودٌ و اغماد) غلافُ السيف : **کێلانی شمشێر**

غمِدَ الليلُ . أظلم ، **شەو تاریك داهات**

غمِدَ البئرُ ، كثُر ماؤها : **بیرەکە ئاوی زۆر بوو**

غَمْرٌ (ج غُمُور و غمار) ماء كثير ، كريم واسعُ الخُلُق : **ئاوی زۆر ، بەخشندەو ڕەوشت بەرز**

غمس الشَيء في الماء ونحوه . غمرهُ فيه : **شتەکەی نوقمی ئاو کرد**

غمَضَ الكلامُ . خفي معناهُ : **قسەکە شاراوە بوو**

غمَضَ المكانُ ، انخفض : **شوێنەکە نزم بوو**

غمَّضَ عينَه . أطبق جفْنيْها : **چاوی نوقاند**

غمَّضَ الكلام . أبْهمه : **قسەکانی بە شاراوەیی کرد**

غُمُوضٌ عدم وُضوح، إبْهامٌ : **ناڕوونشاراوە**

غناءٌ كفاية . ما يُغْتنى به : **بەس بوون ، دەوڵەمەندی**

غنج تدلّل . فهو غنج : **لەنج و لاری کرد ، نازی کرد**

غنم الشيء . فاز به وناله بلا بدل : **شتەکەی بە تاڵان برد**

غنمٌ (ج أغْنام و غُنُوم) شاءٌ : **مەڕو ماڵات**

غنىً اكتفاء و يسار . بُدٌّ: **دەوڵەمەندی، خۆشگوزەرانی (لا غنى عنه) پێویستە**

غنّى طرّب و ترنّم . مدح أو هجا : **سرود و گۆرانی چڕی‌ستایشی کردیان دایشۆری**

غناهُ الله . جعله غنيًا : **خودا دەوڵەمەندی کرد**

غَنِيَ كثُر مالُه ، اكتفى : دەوڵەمەند بوو ، بەسی بوو

غَنِيَ بالمكان ، اقام به : لە شوێنەكە نیشتەجێ بوو

غَنِيَ الرجلُ ، تزوّج : پیاوەكە ژنی هێنا

غَنِيمَةٌ (ج غَنائِم) ما يُؤخذ من العدو بالقوّة : دەستكەوتی جەنگ

غَوَّاصٌ كثيرُ الغَوْص : زۆر چوونە ژێر ئاو

غَوَّاصَةٌ قطعةحربيّة بإمكانها أن تغوص في الماء وتقذف سُفن العدوّ:ژێردەریای جەنگی

غَوْرٌ (ج أغوار) ما انخفض من الأرض ، كهفٌ : نزمایی زەوی ، ئەشكەوت

غُوطَةٌ موضع كثير الماء والشجر : زەڵكاو

غَوْغاءسفلة الناس، الجراد عندمايخفّ للطّيران:هەرچی وپەرچی،بازدانی کوللە

غَوَى و اغوى الرجل ، اضلّهُ : پیاوەكەی گومڕا كرد



غَيْبٌ (ج غُيوب و غياب) سرٌّ ، شكٌ ، ما انخفض من الأرض

: پەنهان ، گومان ، نشێو و نزمایی زەوی

غَيْبَةٌ اغتياب : زەمكردن ، غەیبەت

غَيْبُوبَةٌ غُروب، فقدان الوعي : ئاوابوون ، بێ هۆش بوون

غَيْثٌ (ج غُيُوث و أغْياث) مطرٌ ، سحابٌ ، كلأٌ : باران ، هەور ، لەوەڕ

غَيْرٌ (ج أغْيار) تغيير : گۆڕان

غَيْرانٌ (ج غيارى و غُيارى) ذو غَيْرة : بەغیرەت

غَيْرةٌ (ج غير) شعورٌ بالحميّة ، نخْوةٌ : پەرۆشی ، جوامێری

غَيْمٌ (ج غيوم) سحاب : هەور




## بابُ الفاء ، بەشی پیتی (فاء)

**ف پیتی بیستەمە لە ڕیز بەندی پیتە هیجائییەکان**

فُؤادٌ (ج أفئدة) قلبٌ ، عقلٌ : **دڵ ، عەقڵ**

فِئة (ج فئات و فِئون) جماعة ، طائفة : **کۆمەڵێك ، دەستەیەك**

فائدةٌ(ج فوائد)جزءٌ بالمئة من المال يأخذه من له حساب في مصرف.نفعٌ: **سوو، قازانج**

فائزٌ رابح . مُنتصر : **قازانجکار ، سەرکەوتوو**

فاتحٌ (ج فتحة) قاهرٌ متغلّبٌ : **زاڵی سەرکەوتوو**

فاتحةٌ (ج فواتح) سورة الحمد في القرآن الكريم ، أوَّل الشيء و مبدؤه :

**سورەتی (فاتیحە) ، سەرەتای شتێك و دەستپێکی**

فاترٌ من الماء . ما كان بين البارد والحارّ : **ئاوی شلەتێن**

فاتكٌ (ج فُتّاك) جريءٌ ، قاتلٌ ، سفّاح : **بوێر ، بکوژ ، خوێن ڕێژ ، پیاوکوژ**

فاتنٌ (ج فُتّان) مُضِلٌّ عن الحقّ ، لِصٌّ ، شيطانٌ : **گومڕا ، دز ، ئەهریمەن**

**فاتورة** (ج فواتير) ورقة يسلِّمها البائع إلى المشتري و فيها كشفٌ بأنواع البضاعة المبيعة وأثمانها : **ليستی کڕینی کەل وپەل ، وصلْ**

**فاجأ** هجم عليه بغتة : **لەناکاو هێرشی کردە سەر**

**فاجرٌ** (ج فجرة و فُجّار) زانٍ ، فاسق ، ساحرٌ : **داوێن پیس، فاسیق ، جادوگەر**

**فاجِعةٌ** (ج فواجع) رزينة : **بەلا ، کارەسات**

**فاحَ الحرُّ** ، اشتدَّ وهاج : **بڵێسەی گەرمی تاوی سەند**

**فاحَ المسكُ** ، انتشرت رائحته : **میسکەکە بۆنی بڵاو بۆوە**

**فاحِشٌ** قبيح ، سيِّء الخُلق ، كلّ شيء جاوز الحدَّ : **ناشیرین ، بەدڕەوشت ، هەموو شتێکی لە سنور دەرچوو**



**فاخِرٌ** جيّدٌ من كلّ شيء : **گران بەها**

**فادِحٌ** صعبٌ مُثقلٌ : **سەخت و قورس**

**فأرٌ**(ج فئران)دابّة صغيرة من القواضم : **مشك**

**فارٌّ** هاربٌ : **هەڵاتوو**

**فارسٌ** (ج فُرسانوفوارس) راكب الفرس،خيّال : **ئەسپ سوار ، ئەندێشە دار**

**فارقٌ** (ج فُرّاق) كلُّ ما فرّق بين الحقّ والباطل : **جیاکەرەوە**

**فارُوقٌ** كلُّ ما يُفرّق بين الحق والباطل، لقب عمر ابن الخطّاب (رضي الله عنه) : **جیاکەرەوە لەنێوان ڕاستی و ناڕاستی دانازناوی (عومەری کوڕی خەتتاب)ە**

**فازَ** بالشيء ، ظفر به ، ربح ، كسب : **سەرکەوت ، قازانجی کرد ، بەدەستی هێنا**

**فأسٌ**(ج أفؤس و فؤوس)آلة من حديد ذات عصا قصيرة يُقطع بها الخشب وغير : **تەور**

**فاسدٌ** تالفٌ ، قائم على الفساد ، مبتعد عن الصّلاح : **گەندەڵ کار ، خراپەکار ، دوور لە چاکسازی ، تێکچوو**

فاسقٌ (ج فسقة و فُسّاق) فاجر ، خارج عن طريق الحقّ و الصّلاح : **خراپەكار ، لەرێ دەرچوو**

فاشلٌ ضعيف ، مُتراخٍ ، مُخفق : **لاواز ، سست ، سەرنەكەوتوو**

فاصلَ شريكَهُ ، هجره وترك شركته : **لە هاوبەشی چووە دەرەوە**

فاصلةٌ (ج فواصل) علامة تُستعمل في الكتابة للفصل بين اجزاء الجملة الواحدة : **فاریزە**

فاصوليا بقلة زراعيّة : **فاسۆلیا**

فاضَ الماءُ ، كثُرَ حتّى سال : **لافاو هەڵسا**

فاض الإناءُ ، إمتلأ حتّى طفح : **قاپەكە پڕ بوو هەتا لێی ڕژا**

فاضحٌ فعلٌ ماديٌّ مُخلٌّ بالحياء ، كاشفٌ للمعايب : **كاری بێ شەرمانە ، ئابڕو بەر**

فاضلَ قابل بين الشيئين ليحكم بفضل احدهما على الأخر : **بەراوردی كرد**

فاطر سُورة من سُور القرآن الكريم ، خالق ، مُبْدِعٌ : **سورەتێكە لە قورئاندا ، بەدی هێنەر ، داهێنەر**

فاق الشيء ، علاهُ : **بەرزیكردەوە**

فاق أصحابهُ بالفضل او العلم ، صار خيراً منهم : **پێش كەوت بە چاكەو زانست بەسەر هاوەڵەكانیدا ، لەوانی تر باشتر بوو**



فاقةٌ حاجة ، فقرٌ : **پێویستیی، هەژاریی**

فاقعٌ ناصعٌ صافٍ : **كاڵ**

فاكهانيٌّ بائع الفاكهة : **میوە فرۆش**

فاكهةٌ (ج فواكه) ثمار : **میوە**

فألٌ (ج فُؤول و أفؤُل) ما يتفاءل به الإنسانُ : **ئەوەی مرۆڤ پێی گەشبینە**

فالِج (ج فَوالِجُ) شللٌ يحدث في احد شقّي البدن ، مكْيالٌ : **نەخۆشی ئیفلیجی ، پێوانە**



فانُوسٌ (ج فَوانيس) مصباح ، نمّام : **چرا ، دووزمان**

فَتاةٌ (ج فتيات و فتَوات) مؤنث فتى : **کچ ، کیژ**

فُتاتٌ ما تكسّر من الشيء المفتوت وتساقط : **پارچەی شکاو لەنان و شتی تر**

فَتّاحٌ من اسماء الله الحسْنى لأنّه يفتح أبواب الرِّزق والرّحمة العباده : **ناوێکە لە ناوە جوانەکانی پەروەردگار**

فَتّاحَةٌ آلة تُفتح بها علبُ الصفيح و نحوُها : **کلیلی قوتو هەڵپچڕین**

فَتّاكٌ شديدُ الفتْك : **کوشندە**

فَتّانٌ كثير الفتْن ، شيطان ، صائغ : **ئاژاوەچی ، شەیتان ، زێڕەنگەر**

فتح البابَ خلاف أغلقهُ ، قضى ، نصر : **دەرگاکەی کردەوە ، سەرکەوت**

فتح الجلسةَ ، بدأ عملها : **دانیشتنەکە دەستی پێکرد**

فتحةٌ علامة النّصب ، حركة الفتْح في اللُغة : **نیشانەی نەصبە لە ڕێزمانی عەرەبی ، بزوێنی فەتحە لە زمانی عەرەبیدا**

فترٌ ضعفَ ، فتور : **لاوازی ، سستی**

فترةٌ (ج فتَرات) ضعفٌ وانكسار ، مُدّةٌ : **لاوازی و شکان ، ماوەیەك**

فتش عنه ، سأل وبحث ، فحص ، راقب : **لێی کۆڵییەوە ، پشکنی ، چاودێری کرد**

فتقٌ (ج فُتوق) علّة ينشقُّ معها الصّفاقُ في أسفل البطن : **نەخۆشی فتق**

فتك بطش ، غدر : **هێرشی بردە سەر ، ناپاکی کرد**

فتل الحبل ، لواهُ : **پەتەکەی لول دا**

فَتَلَ وجْهَهُ عنهم ، صرفَهُ :   **ڕووی لێ وەرگێڕان**

فُتِنَ أصابته فتنةٌ فذهب مالُه أو عقلُه :   **تووشی بەلاّ هات**

فِتْنَةٌ (ج فِتَن) ضلال ، اختبار بالنّار ، إعجاب بالشّيء :   **گومڕایی ، تاقی کردنەوە بە ئاگر ، سەرسام بوون بە شتێك**

فُتُوَّةٌ شباب ، نجْدة :   **گەنج ، فریاکەوتن**

فُتورٌ لينٌ بعد حدّة و شدّة ، ضعفٌ :   **هێور بوونەوە ، لاوازی**

فَتْوَى (ج فتاوٍ و فتاوى) ما افتى به العالم و أجاب عنه من المسائل الشرعيّة أو نحوها :   **فتوای زانا**

فَتًى (ج فِتْيان و فِتْيَة) شابٌّ في مقتبل العمر :   **تازە لاو**

فَتِيلٌ خيطٌ يوصل بالمتفجّرات أو الألعاب الناريّة فيُفجّرها إذا أُشعل ، ما يُفتل بين الأصابع من وسخ :   **پلیتەی تەقەمەنی ، چلکی ناو پەنجە**

فَتِيلَةٌ (ج فتائل) خرقة المصباح الّتي تُشعل :   **پلیتەی چرا**

فَجَّ فتح و باعد ما بين رجليه :   **قاچەکانی کردەوەو لێکی دور خستەوە**

فَجَأَ الرجل، هجم عليه بغتةً من غير أنْ يشعُر به:   **هێرشی کت و پڕی کردە سەر**

فُجَاءَةً بغتةً :   **کت و پڕ**



فَجَّرَ القنبلة ، أشعلها لتتفجّر :   **بۆمباکەی تەقاندەوە**

فَجْرٌ ضوء الصباح،سُورة من سُور القرآن الكريم :   **سپێدەی بەیان ، سوورەتێکە لە قورئانی پیرۆز**

فَجْرٌ جُودٌ ، معروفٌ :   **سەخاوەت،چاکەوپیاوەتی**

فَجَلَ الشيء ، عرَّضَهُ :   **شتەکەی پیشاندا**

فُجْلٌ نبات يؤكل جذره نيئاً :   **توور**

فَجْوَةٌ (ج فَجَوات و فِجاء) فُرْجةٌ بين شيئين ، ساحةُ الدّار :   **کون و کەلەبەر ، حەوشەی خانوو**

فُجُورٌ ارتكابُ المعاصي : **گوناه کردن**

فَجِيعَةٌ (ج فجائع) رزيئة، مُصيبة، خطْبٌ : **کارەسات ، لێ قەومان ، تەنگ و چەڵەمە**

فُحْشٌ ما قبُح من قول او فعل : **قسەو کاری ناشرین**

فحْشاء زنىً . فُحْش : **زینا ، خراپەکاری**

فحصَ الشيء ،كشفَهُ : **سۆراغی شتەکەی کرد**

فَحَصَ عن الأمر ، استقصى في البحث عنه : **لە کارەکەی کۆڵییەوە**

فَحْصٌ (ج فُحُوص) استقصاءٌ في البحث : **پشکنین**

فَحْلٌ (ج فُحولٌ و أفْحُل) الذكرُ القويُّ من كلِّ حيوان : **نێرەی بەهێزی هەموو گیانلەبەر**

فَحَمَ عجز عن الجواب ، انقطع نفَسُهُ من كثره البكاء : **دەمکوت بوو ، نوزەی لێ بڕا لەبەر گریانی**

فَحْوَى (ج فحاو و فحاوى) الكلام ، مضمونه ومرْماهُ : **ناوەڕۆکی قسە**

فحيحٌ صوت الحيّة من فيها : **فیشکەی مار**

فَخٌّ (ج فخاخٌ و فُخُوخٌ) مصيدة تُصاد بها الحيوانات : **تەڵە**

فَخارٌ فَخْرٌ : **خۆهەڵکێشان**



فَخامَةٌ عظمة القدْر ، لقب رئيس الجمهوريّة :
**شکۆدار ، نازناوی سەرۆك کۆمار**

فَخْتٌ ضوء القمر او ظِلُّه ، شُقُوق مُستديرة في السّقف : **ڕوناکی یان سێبەری مانگ ، درزی بازنەیی لە سەقفدا**

فَخِذٌ (ج افخاذ) ما بين الركبة والورك : **ڕان**

فَخر ترفع ، تكبّر : **شانازی کرد، خۆی بە زل زانی**

فخرٌ فضلٌ : **شانازیی**

فَخُم علا قدرُه و ارتفعت منزلته . ضخُم : **بەرزو بەرێز بوو ، مەزن بوو**

فَخْمٌ عظيم القدر : **شكۆدار**

فَخورٌ متباهٍ.متمدّح بالخصال والمكارم : **خۆهەڵكێش ، شانازی کەر بە چاکەکان**

فدائيٌّ مجاهدٌ في سبيل الله أوالوطن مضحّيا بنفسه: **تێکۆشەر لەپێناوی خواونیشتیمان**

فدّانٌ ( ج فُدُن و أفدِنة و فدادين) مساحة تُقدّر بنحْو (٤٢٠٠) متر مربّع : **فەددان ، ڕووبەرێکە بە (٤٢٠٠) مەتر دووجا دادەنێت**

فدغ الشيء . كسرهُ : **شتەکەی شکاند**

فدى الرجل من الأسْر،خلّصه بمال أو نحوه:**بەپارە پیاوەکەی لە دیلی ڕزگار کرد**

فذٌّ (ج افذاذ و فذوذ) فردٌ . لا نظير له في مكانته : **تاك ، بێ وێنە**

فرّ هرب : **هەڵات**

فرّاءٌ صانعُ الفِراء وبائعُها : **وەستا و فرۆشیاری کەوڵ**

فُراتٌ ماءٌ شديدُ العُذوبة : **ئاوی زۆر سازگار**

فرّارٌ زئبق سرعة سيلانه ، سريع الفرار : **(جیوە) چونکە زوو شل دەبێتەوە ، خێرا لە ڕاکردندا**

فِراسةٌ استدلال بظوهر الأمور على خفاياها : **دووربینیی ، زیرەکیی**

فَراشٌ جنسُ حشراتٍ ذات ألوان جميلة: **پەپوولە**



فراغٌ خُلُوٌّ.مكانٌ خال: **بە تاڵەشوێنی چۆڵ**

فِراقٌ انفصال . فُرقةٌ : **جیا بوونەوە ، هەڵوەشان ، دوورکەوتنەوە**

فرّانٌ خباز : **نانکەر**

فَرْجٌ (ج فُرُوج) شقٌّ بين شيئين ، عوْرة : **درزو کەلێن ، شەرمگە**

فَرَجٌ إنكشاف الغمّ : **دەرو لێبوونەوە**

فَرَّجَ كشف عنهُ الهمّ والحزن : **دەروی لێ بۆوە ، خەمی نەما**

فَرِحَ انشرح صدرُه وابتهج ، سُرَّ : **شادمان بوو ، دڵخۆش بوو**

فَرَحٌ سُرور : **شادومانی**

فَرْخٌ (ج فِراخ و أفْرخة) ولد الطائر : **بێچووی باڵندە**

فَرَّخ الطائرُ صار ذا فَرْخ : **باڵندەکە بێچوی هەڵهێنا**

فَرْدٌ (ج فراد) نصف الزّوج ، الذي لا نظير له : **تاك ، بێ وێنە**

فِرْدوْسٌ (ج فراديس) اعلى منزلة في الجنّة : **بەرزترین پلەی بەهەشتە**

فرز الشيء من غيره ، عزلهُ و نحّاهُ : **جیای کردەوە و دووری خستەوە**

فُرْسٌ شعبٌ يسكن بلاد "فارس" المعرفة اليوم بـ "إيران" : **میللەتی فارس**

فَرَسٌ (ج أفْراس و فُرُوس) حيوانٌ أهليٌّ يُتَّخذُ للركوب والجرّ : **ئەسپ**

فَرْسخٌ (ج فراسخ) شيءٌ دائم كثير لا ينقطع ، فُرْجةٌ ، مقياسٌ قديمٌ من مقاييس الطول يقدّر بثمانية كيلومترات : **شتێکی بەردەوامی زۆر نەبڕاوە ، کون و کەلەبەر ، فەرسەخ پێوانە یێکە هەشت کیلۆ مەترە**



فَرْسخَ اتّسع : **فراوان بوو**

فرش بسط الشيء : **ڕای خست**

فَرْشٌ ما فُرش من متاع البيت : **ڕایەخ**

فُرْشاة (ج فراش) آلة تُنَظّف بها الأسنان أو تستعمل الدّهان أو لتصفيف الشّعر: **فلچە**

فَرْصةٌ (ج أفْرصة) داءٌ يُصيب فقار الظّهر ويؤدّي إلى الحدب: **نەخۆشی بڕبڕەی پشت**

فرصةٌ (ج فرص) وقت مناسب ، نوبةٌ : **هەل و دەفەرت ، نۆرە**

فرض الأمرَ ، اوجبه : **کارەکەی فەرز کرد**

فرْضٌ (ج فروض) ما أوجبه الله على عباده : **فەرز**

فرط القوم ، تقدّمهم : **بە پێشیان کەوت**

فرّط الشيء ، ضيّعه : **لەدەستیدا**

فرّط في الشيء ، قصّر فيه حتّى فات : **کەمتەرخەمی کرد تا لە دەستی چوو**

فرْعٌ (ج فروع) أعلى الشيء ، شعرٌ تامٌّ : **لوتکەو سەرچڵ ، شیعری تەواو**

فرعون (ج فراعنة) لقبُ كلّ ظالم عاتٍ متجبرٍ : **فیرعەون ، نازناوی هەموو ستەمکارێکە**



فرعيٌّ ثانويٌّ : **لاوەکی**

فرغ الفرس توسّع في سيره: **ئەسپەکە خێراتر غاریدا**

فرغ خلا : **بەتاڵ بوو**

فرْقٌ قطيعٌ عظيمٌ من الغزلان او البقر اوالغنم ، طائفة من الصبيان : **مێگەلی گەورە ، ڕەوە منداڵێك**

فرْقٌ مقدارُ زيادة : **جیاوازی**

الفرقان القرآن الكريم ، سورة من سور القرآن الكريم ، كلّ ما فرّق به بين الحق والباطل : **قورئانی پیرۆز ، سورەتێکە لە قورئان ، جیاکەرەوە لەنێوان حەق و ناحەقدا**

فرقةٌ (ج فرق) طائفة من الناس : **کۆمەڵێك**

فرقةٌ افتراق : **دابڕان**

فرك الشيء ، حكّه ، دلكه : **خوراندی،شێلای**

فرنٌ (ج افران) موقدٌ للخبْز وغيره : **فڕنی**



**فَرْوٌ**(ج فراء) جلودُ بعض الحيوانات : **پێست**

**فَرُّوجٌ** (ج فراريج) فرخ الدجاجة خاصّةً :

**جوجکە ، فڕوج**

**فُرُوسِيَّةٌ** مهارة في أمور الخيل وركوبها :

**ئەسپ سواری ، سوار**

**فَرِيدٌ** متفرِّد ، لا نظير له : **تاك ، بێ وێنە**

**فَرِيسَةٌ** ضحيّة . ما يفترسه الحيوانُ : **قوربانی ، نێچیر**

**فَرِيضَةٌ**(ج فرائض) ما تفرضه الاديان من الواجبات: **ئەرك و فەرزە ئاینییەكان**

**فَرِيقٌ** (ج أفرقة و فُرقاء) طائفةٌ من الناس ،رُتبه عسكريّة عُليا : **كۆمەڵێ خەڵك ، پلەیەكی بەرزی سەربازییە**

**فَزّاعَةٌ** كثيرُ الفزع . ما يُنصب في الحقول لتخويف الوحوش والطيور : **زۆر بەترس ، (داوەڵ) كە بۆ ترساندنی باڵندەو دڕندە دادەنرێ لە كێڵگەكاندا ، داهۆڵ**

**فَزَّةٌ** وثبةٌ بانْزعاج : **ڕاچڵەكین**

**فَزَرَ** الشيء ، شقَّهُ : **شتەكەی لەت كرد**

**فَزِعَ** خاف و ذُعِر :**ترسا و تۆقی**

**فَزَعٌ** ذُعْرٌ.خوفٌ شديدٌ : **تۆقین،ترسێكی زۆر**

**فَسا** أخرج ريحا من غير صوت : **فسی كرد ، بای لێ دەرچوو**

**فَسادٌ** أخذُ المال ظُلْما.تلفٌ.لهوٌ ولعبٌ :

**بردنی ماڵ بە ستەمەبە فیڕۆدان، گاڵتەو گەپ**



**فُسْتانٌ** (ج فساتين) ثوب المرأة : **كراسی ئافرەت**

**فُسْتُقٌ** شجرٌ لذيذ الثّمر : **فستق**

**فُسْحَةٌ** (ج فُسح) فرجة بين البيوت وغيرها .

..... : **كەلێن ، فراوانی**

فسَخَ رأيَه : فسد : **ڕای خۆی هەڵوەشاندەوە**

فسَخَ العقد : نقضه : **گرێ بەستەکەی هەڵوەشاندەوە**

فسدَ تلف : **گەندەڵی کرد**

فسَّدَ صيّرهُ فاسداً : **تێکیدا**

فسْق ابتعاد عن الطّريق المستقيم ، فجور : **دورکەوتنەوە لە ڕێگای ڕاست ، گوناهەکان**

فسَقَ عصى أمر الله ، خرج عن طريق الحقّ :**سەرپێچی فەرمانی خوای کرد ، لە ڕێی ڕاست دەرچوو**

فُسَيْفساء قطعٌ ملوّنة من الرخام : **کاشی ڕەنگاوڕەنگ**

فشلَ كسُلَ وضعُفَ ، اخفق : **تەمبەڵ و تەوەزەل بوو ، تێك شکا**

فصاحَةٌ بيان وسلامة الكلام من التعقيد : **ڕەوان بێژی ، خۆشخوانی**

فصْحٌ عيد عند النّصارى : **جەژنێکی گاورەکانە**

فصُحَ صار فصيحاً في كلامه : **زمان پاراو بوو**

فصدَ المريض : شقّ عرْقه : **خوێنی نەخۆشەکەی گرت ، کەڵەشاخی بۆ کرد**

فصْلٌ (ج فصول) مرحلة من مراحل السنة الأربع ، حاجزٌ بين شيئين ، موضع المفصل : **وەرز ، بەربەست ،بەش**

فصَّلَ بيّنَ ، اوضح : **ڕوونی کردەوە ، دەری خست**

فصلَ الشّيء ، قطعهُ : **شتەکەی بڕی**

فصلَ القاضي بين الخصمين ، حكم : **قازیەکە دادگایی لە نێوان دوو کەسکرد**

فصمَ العقدة ، حلّها : **گرێکەی کردەوە**

فصمَ الشيء ، شقّهُ : **شتەکەی کەرت کرد**

فضَّ الشيء ، كسره وفرّقه : **شتەکەی شکاند و جیایکردەوە**

فضَّ الأمر . قطعه وانهاهُ :   **کارەکەی پچڕاندو کۆتایی پێهێنا**

فضاءٌ  ما اتَّسع من الأرض ،مدًى واسعٌ محيطٌ بالأرض، جوٌّ : **پانتایی ، ئاسمان ، هەوا**

فضّالٌ كثيرُ الفضل :   **زۆر چاكەكار**

فضّةٌ معدن أبيضُ لمّاع :  **زیو**

فضَح الصُّبْحُ ، طلع :   **بەیانی داهات**

فضِحَ  كان أبيض وليس شديد البياض :  **سپی سادە**

فضّضَ الشيء ، طلاه أو حلّاه بالفضّة : **بەزیو ڕووپۆشی كرد**

فضفاضٌ من الثياب او العيش ، واسع، كثير العطاء : **جل و بەرگی فش و فراوان ، زۆر بەخشندەیی**

فضلٌ (ج فضول)  إحسان ، بقيّةٌ ، زيادةٌ :   **چاكە ، پاشماوە ، زیادەیی**

فضَل    زاد على الحاجة أو المطلوب :  **زیاتر بوو خواست  و پێویستی**

فضُل   صار ذا فضل :   **بوو بە خاوەن چاكە**

فضلةٌ  (ج فِضال و فضلات) بقيّةٌ من شيء ، خمرٌ :   **بەرماوەشەراب**

فُضوليٌّ  من يتدخّل في ما لا يعنيه :   **خۆ تێ هەڵقورتێنەر**

فضّيٌّ   ما كان بلون الفضّة :  **زیوی**

فضيحةٌ (ج فضائح)  انكشافُ المساوىء وانتشارها  :  **ئابڕوو چوون**

فضيلةٌ  (ج فضائل)  مزيّةٌ ، درجةٌ سامية في الفضل و الأخلاق الحميدة، لقب الشيخ :   **ئەدگار ، ڕەوشت بەرزی ، ڕێزدار**

فطامٌ   قطعُ الولد عن الرّضاع :  **لەشیر بڕینەوەی كۆرپە**

فُطرٌ (ج أفطار و فُطور) حبّات العنب اوّل ما تظهر .  جنسُ نباتٍ يُسمّى أيضاً فطريات :   **بەرسیلەی ترێ،كوارگ**

فطر الأمرَ ، اخترعه :  كارەكەی داهێنا

فطر الشيءَ ، شقّه :  شتەكەی كەرتكرد

فطرَ الصائمُ ، أكل أو شرب : ڕۆژووی شكاند

فِطْرةُ (ج فِطَر) صفة الإنسان الطبيعيّة :  سروشتی مرۆڤ

فطسَ مات :  مرد

فطسَ الحديد ، عرّضهُ :  ئاسنەكەی پان كردەوە

فطم الرضيع ، قطعهُ عن الرَضاع :  كۆرپەی لە شیر بڕییەوە

فطنٌ (ج فُطُن و فُطْن) حاذقٌ فهيمٌ :بیرتیژو تێگەیشتوو

فطنَ فطن ،بالأمْر وإليه و به ، ادرَكه و فهمَهُ :  لە كارەكە حاڵی بوو و تێگەیشت

فِطْنَةٌ  حذقٌ و مهارةٌ و ذكاءٌ :  بیر تیژی ، شارەزایی ، زیرەكی

فطورٌ ما يُفطر عليه صباحاً من الطعام :  نانی بەیانی

فطيرةٌ (ج فطائر) رقاقة من عجين توضع فيها التوابل او اللحوم وانواع الخضرة وتخبز ، ما يُعجن بالسَمن أو الزَيْت :  كولێرە بە گۆشت و شتی ترەناسكە نان

فظٌّ (ج افْظاظ) : غليظ خشنُ الكلام،سيّء الخُلُق :  قسە ڕەق،بێ ئابڕوو

فظٌّ  نوعٌ من السباع المائية : فیلی دەریا

فظُع الأمر : صيَّرَهُ فظيعاً :  ئیشەكەی گەورە كرد

فعالٌ  فعلٌ حميد،كرمٌ :  ڕەفتاری جوان،بەخشین

فعْلٌ (ج فعال و افعال) عَمَلٌ ، ما دلَّ على حدثٍ :  كردار ، ڕووداو

فعل الشيء ، عمله :  كارەكەی كرد

فغر فاهُ ، فتحهُ :  دەمی كردەوە

**فقأ** الدمل شقّه ليُخرج مافيه من القيح: **دومەڵەکەی دڕی تاکێمی لێ بێتە دەرەوە**

**فقأ** حبّ الرّمان . عصرهُ : **دەنکە هەناری گوشی**

**فقرَ** حفر . كسر : **چاڵی لێ دا ، شکاندی**

**فقرَ** فقدته الداهية . نزلتْ به : **توشی بەلاّ هات**

**فقِرَ** اشتكى فقار ظهره من كسر أو مرض : **سکاڵای لە بڕبڕەی پشتی کرد لەبەر شکان و نەخۆشی**

**فقْرة** (ج فقْر و فقَرات) خرزة من حرزات الظّهر في العمود الفقري . جزء من نص : **بڕەیەك لە بڕبڕەی پشت، بڕگەیەك لە دەقەکە**

**فقس** الطائرُ بيضته . كسرها وأخرج ما فيها : **باڵندەکە هێلکەکەی تروکاند**

**فقطْ** لا غير . فحسْب : **هیچی تربەس**

**فُقْمَة** (ج فُقْمات و فُقم) حيوان برمائي من اللّبُونات : **گوێلکی دەریا**

**فقُهَ** صار فقيهاً : **بووە زانا**

**فقهَ** الشيء أو الكلام . فهمه : **لەشتەکە یان لە قسەکە حاڵی بوو**

**فَقَهَ** الرجل : غلبه في العلم : **لە زانستدا سەرکەوت**



**فقيدٌ** مفقودٌ : **بزر ، ون ، گوم بوو**

**فقيرٌ** (ج فقَراء و فقُ) مُحتاجٌ : **هەژار**

**فقيرٌ** من يشتكي فقار سلسلة ظهره من كسرٍ أو مرض : **ئەوەی سکاڵا دەکا لە دەست ژان و نەخۆشی بڕبڕەی پشتی**

**فقيهٌ** (ج فقهاء) من كان شديد الفهم عالما ذكيّاً . عالم بأصول الشريعة و أحكامها : **زانایەکی لێ هاتوو، زانا لە ئاین و شەریعەتدا**

**فكّ** العظمُ . مال عن موضعه : **ئێسکەکە لەجێ چوو**

**فكّ** الأسير . حرّره : **دیلەکەی ئازاد کرد**

**فكَّ** الشيء ، فصل أجزاءهُ :  **شتەکەی لێك هەڵوەشاند**

**فكَّ** العقدة ، حلَها :  **گرێیەکەی کردەوە**

**فُكاهةٌ** مُزاح، ما يُتمتَّع به من الحديث : **گاڵتەو گەپ ، قسەی نستەق**

**فكْرٌ** (ج أفكار) إعمال العقل في أمر :  **هزر**

**فكَّر**  فكر :  **بیری کردەوە**

**فكر** في الشيء،أعمل الفكر والعقل فيه ليتوصّل إلى حلّه:**بیری لەشتەکە کردەوە**

**فكْرةٌ** (ج فكر) خاطرة ذهنيّة ، رأي :  **بیرۆکە ، بۆچوون**

**فكَّكَ** الشيء ، فصّله وفرّق أجْزاءهُ :  **شتەکەی لێك هەڵوەشاند**

**فكه**  صار مازِحا :  **بوو بە سوعبەت چی**



**فلَّ** السيفُ أو نحوُه،إنكسر حدّهُ :**شمشێرەکە کول بوو**

**فلاّحٌ**(ج فلاّحون و فلاّحة)مُحترفُ الفلاحة:**جوتیار**

**فلاحةٌ**  حرفةُ الزِّراعة :  **جوتیاری**

**فُلانٌ**  كناية عن العلم العاقل :  **فلآنە کەس**

**فلحٌ**  صلاحُ الحال ، بقاءٌ ، شقّ في الشّفة السُّفلى :

**حاڵ خۆش ، مانەوە ، قڵیشانی لێوی خوارەوە**

**فلّس** القاضي الرجُل ، حكم بإفلاسه :  **دادوەر بڕیاری لات کردنیدا ، دادوەر هەموو پارەکەی لێ سەند**

**فلْسٌ**  (ج فُلوس و أفلُس) قطعة من النّقد مضروبة من النُّحاس :  **فلس (پارەیەکە لە مس دروست دەکرێت)**



**فلسفة** دراسةُ المبادىء الأولى و تفسيرُ المعرفة تفسيرا عقليّاً

حكمة: **فەلسەفە ، دانایی**

**فلع** الشيء ، شقّهُ :  **شتەکەی کەرت کرد**

**فلفلٌ**  نبات ينبت في البلاد الحارّة :  **بیبەر**

فَلْقٌ نصف الشيء المفلوق ، أمرٌ عجيب ،مصيبة : **نيوەی شتێك، كارێكی سەرسوڕهێنەر ، كارەسات**

الفَلَقُ (ج فُلْقَان) ظهُورُ الحقِّ ، شقٌّ في الجبل ، صُبْحٌ : **دەركەوتنی ڕاستی، درزێك لە چیا ، بەیانی**

فَلْكٌ ناتىء العظام بارزها ، من به ألم في فَلْكَة ركبته : **ئێسكی دەرپەڕیو لە لەشدا ، ئازاری ئەژنۆ**

فلكيٌّ عالمٌ بعلم الفلك : **گەردوونناس**

فُلَيْفلَةٌ نبات أخضر يحمرّ بعضُ أصنافه عند النضج : **بیبەر**



فَلّينٌ مادةٌ ليِّنةٌ من لحاء الشجر : **تەپەدۆر ، فلین**

فَمٌ (ج أفْوام و أفْمام) ما ينفتح للتكلُّم وتَناوُل الطعام : **دەم**

فَنٌّ (ج فُنون) إبداعٌ ، نوع : **هونەر ، جۆر**

فناءٌ هلاك ، زَوال ، موت : **لەناوچوون ، نەمان ، مردن**



فنّان صاحبُ موهبة فنيّة ، مُبْدِعٌ : **هونەرمەند ، داهێنەر**

فِنْجانٌ (ج فَناجين) قدحٌ صغير : **فنجان**

فَنَد ضعُف عقلُه من الكبر ، كذب ، أخْطأ :**خەڵەفا ، درۆی كرد ، هەڵەی كرد**

فُنْدُقٌ (ج فنادق) مكان ينزل فيه المسافرون: **میوانخانە ، هۆتێل**

فَنٌ (ج أفنان) غُصنٌ مستقيم : **لقە داری ڕاست**

فَنِيَ عدم ، اضمحلّ : **لەناو چو ، پوكایەوە**

فَنِيَ في الشيء ، اندمج فيه وغاب : **چووە ناویەوە و ون بوو**

فَهِدَ مُتغافلٌ : **بێ ئاگا**

فِهْرِسٌ (ج فهارس) جدولٌ في أوّل او آخر الكتاب يتضمّن ذكر ما فيه من الأبواب : **پێرست ، ناوەڕۆك**

فَهِمٌ سريع الفَهْم : **زووحاڵیی**

فَهِمَ الأمْرَ: عَلِمَهُ : **لە کارەکە گەیشت**

فَهِيمٌ (ج فُهَماء) صاحبُ فَهْمٍ : **تێ گەیشتوو**

فُو نبات يُعالَج به ألم الجنب وداء الثعلب : **ڕووەکێکە بەکار دێت بۆ نەخۆشی زگئێشە و دەردە ڕێوی**

فَوّارٌ كثير الفَوَران : **زۆر هەڵچوو**

فَوَّجَ عن نفسه : برَّد ازال همومه : **ساردبۆوە ، خەمی نەما**

فَوْجٌ (ج أفْواج) جماعة من الناس ، طائفة من الجيش : **کۆمەڵە خەڵکێك ، کۆمەڵێك لە سوپا ، فەوج**

فَوَرانٌ غليان ، هَيجان : **کوڵان ، هەڵچون**

فَوْرِيٌّ ما يتمُّ من غير تأخُّر : **دەست بەجێ**

فَوْزٌ نجاحٌ ، ظَفَرٌ : **دەرچون ، سەرکەوتن**

فُوسْفُورٌ مادّةٌ سريعة الاشتعال تُضيء في الظلام **توخمی فۆسفۆر**

فَوَّضَ إليه الأمرَ : جعله حُرَّ التصرُّف فيه ، وكَلَهُ عليه : **کارەکەی پێ سپارد ، گردی بە بریکاری کۆی**

فَوْضَوِيٌّ غير منظَّم ، غير مرتَّب : **نارێك ، بێ سەروبەر**

فَوْضَى اختلال النّظام :**شپرزەیی ، شڵەژاویی**



فَوْقَ ظرف مكان يدل على الارتفاع ، ظرف زمان يدلّ على الأكثر، الفضل : **لەسەر ، زیاتر ، زیادە**

فُولٌ نبات من القطانيّات يحمل حبوباً صالحة للأكل : **پاقلە**

**فُولاذ** حديد يخالطه شيء من الكربون : **پۆلا**

**فُوهَةُ** (ج فُوهات) البُركان : فُتحتُهُ: **کونی بورکان**

**في** حرف جرّ: **ئامرازی پەیوەندی (لە)**

**فَيْء** (ج أفياء و فُيوء) قطعة من الطير ، غنيمة ، ظلٌّ : **رەوە باڵندە ،دەستکەوتی جەنگ ، سێبەر**

**فَيّاضٌ** كثيرُ الماء ، كريمٌ معْطاء : **ئاوی زۆر ، بەخشندە**

**فِيتُو** حقُّ النَّقْض في مجلس الأمن : **مافی (ڤیتۆ) لە ئاسایشی نێودەوڵەتی**

**فَيْحاءُ** دار واسعة ،حساء فيه توابل: **خانوی گەورە ، شۆربایەك بەهاراتی تێکرابێت**

**فَيْرُوزٌ** حجرٌ كريم ازرقُ يميل إلى الخُضرة : **فەیرۆز ، بەردێکی بەنرخی شینی مەیلەو سەوزە**

**فَيضانٌ** تدفِّق الماء بكثرة عند اشتداد المطر او ذوبان الثلوج : **لافاو**

**فِيلٌ** (ج أفْيال و فِيلة و فُيول)حيوان ضخم الجثّة له خرطوم طويل و ذيْلٌ قصير : **فیل**

**فَيْلَسُوفٌ** (ج فلاسفة) عالم باحثٌ في فُروع الفلسفة : **فەیلەسوف**

**فَيْلَقٌ** (ج فيالق) فرقة عظيمة من الجيش ، أأأأمرٌ عجيب : **پەکە و تیپێکی گەورەیە لە سوپادا ، کارێکی سەیرو سەمەرە**

**فَيْلَم** (ج فيالمُ) جبان ،بئرٌ واسعة الفم،مُشط : **ترسنۆك ، بیرێکی دەم فراوان ، شانە**




## بابا القاف ، بەشی پیتی (قاف)

ق الحرف الحادي والعشرون من حروف الهجاء : **پیتی بیست و یەکەمینە لە ریزبەندی پیتە هیجائییەکان**

قائدٌ (ج قادة و و قُوَّاد و قُوَّد) من يقود الجيش : **سەر لەشکر ، سەرکردە**

قائلٌ (ج قُوَّل و قُيَّل) متكلِّم : **قسەکەر**

قائمٌ (ج قُوَّم و قُيَّم و قُوَّام) واقف : **وەستاو**

قائمةٌ (ج قوائم) ورقة تبيّن الحساب أو أنواع الطعام : **لیست**

قائمةٌ زاوية قائمة ، زاوية من (٩٠)درجة : **گۆشە وەستاو کە (٩٠) پلەیە**

قابضٌ من أسماء الله الحُسنَى : **وەرگر ، ناوێکە لەناوە پیرۆزەکانی خوا**

قابل لقيه مواجهةً : **بەرەو رووی بووەوە ، قسەی لەگەڵ کرد**

قابليّةٌ استعدادٌ للقبول والقدرة : **توانا**

قاتل مميت : **بکوژ**

قاتمٌ (ج قواتم) شديدُ السَّواد : **زۆر رەش**

قاحلٌ يابس ، مُجْدِبٌ : **وشك و برینگ ، وشکەسالی**

قاد السيّارة او الطائرة ، ساقها : **ئۆتۆمبێل یان فڕۆکەی لێخوڕی**

قاد الدابة : مشى أمامها آخذاً بقيادها : **ولاخەکەی لێ خوڕی ، جڵەوی ولاخەکەی گرت و هاژوای**

قاد الجيش ، رأسه : **سەر لەشکری کرد**

قادرٌ من اسماء الله الحسنى ، مُستطيعٌ: **یەکێکە لەناوە پیرۆزەکانی خوا، بەتوانا**

قاذفةٌ نوع من الطائرات الحربيّة : **فڕۆکەی بۆمبا هاوێژ**

قارَّ في الصلاة ، سكن فيها و لم يتحرّك : **بێ جوڵە بوو لە نوێژدا**



قاربٌ (ج قوارب) زورقٌ : **بەلەم**

قارّةٌ في الجغرافيا ، قطعة عظيمة من اليابسة : **کیشوەر لە جوگرافیەدا**

قارسٌ شديد البُرودة : **زۆر سارد**

قارعةٌ (ج قوارع) يوم القيامة ، نكبة مُهلكة : **ناوێکە لە ناوەکانی ڕۆژی دوایی ، کارەساتی کوشندە**

قارعةُ الطريق : وسطه الذي يقرعه المارّة بأرجلهم : **ناوەڕاستی ڕێگا**

قارنَ الشيء بالشيء : قاسه به و وازنه : **شتێکی بە شتێك بەراورد کرد**

قارورةٌ (ج قوارير) إناءٌ مستطيل ، حدقة العين ، وعاء التمر : **قاپی شوشە ، گلێنەی چاو ، سەبەتەی خورما**

قاسٌ قدْرٌ ، مقدار ، مسافة : **ڕادە ، ڕێژە ، ماوە**

قاسمٌ (القاسم المشترك) بين عدّة أعداد ، هو عدد يقسمها جميعاً قسمة تامّةً : **دابەشکەری هاوبەش لە نێوان چەند ژمارەیەك لە ژمارەکاندا**

قاسى الألم ، عاناه ، عالج شدّته : **ئازاری چەشت ، چارەسەری ناخۆشی کرد**

قاصٌّ من يكتب بالقصّة أو يكتبها : **چیرۆکنووس**

قاصرٌ لم يبلغ سنّ الرشد : **منداڵ بەر لە پێ گەیشتن**

قاضي حاكم : **حوكمی بۆ كرد ، لێپێچینەوەی كرد**

قاطرةً عربة تجرُ القطار على أسلاك الحديد : **ڕاكێشەر**

قاطع ترك زيارته أو مصاحبته أو التعامل معه : **پەیوەندی لەگەڵدا پچڕاند**

قاع الخنزيرُ ، صوّت : **بەرازەكە لوراندی**

قاعةً (ج قاعات) ردهة الاستقبال او الاجتماع ، ساحة الدار : **هۆڵ ، حەوشە**

قاعدً (ج قعود) عن الأمر ، غيرُ مهتمّ به ، المرأة التي انقطعت عن الولد أو عن الزوج : **وازهێنان لە كاركردنكەمتەرخەم لە كارەكە ، ژنی دابڕاو لە منداڵ و مێرد**



قاعدةً (ج قواعد) ضابطٌ ، قانون : **بنكە ، یاسا**

قاعدةُ البلاد ، اكبرُ مدنها : **گەورەترین شاری وڵات**

قاعدةُ البناء ، أساسه : **بناغەی باڵەخانە**

قافلةٌ (ج قوافل) رفقة راجعة من السفر او مبتدئة به و معها دوابُها : **كاروان**

قافيةٌ (ج قوافٍ) آخر كلمة في بيت الشعر : **قافیە لەهەڵبەستدا ، سەروا**

قافيةٌ من كلّ شيء ، آخره : **كۆتایی هەموو شتێك**

قال تكلّم : **گوتی**

قالبٌ (ج قوالب) وعاء تُصبّ فيه السوائل التي تتجمّدُ لتأخذ شكل هذا الوعاء **قاڵبی داڕشتن**



قام انتصب واقفاً : **هەستا سەر پێیان**

قام الأمرُ : اعتدل : **كارەكە ڕێك بۆوە**

قامةُ الإنسان ، قدُّه : **بەژنی مرۆڤ**

قاموسٌ (ج قواميس) معجم : **فەرهەنگ**

قانعٌ (ج قُنّع) راضٍ بما قسم له : **بەقەناعەت**

قانُونٌ(ج قوانين)مجموعةُ الشرائع و النُّظم: **یاسا**

قانُونٌ الةٌ من آلات الطَّرب ذات أوتار : **(قانون) ئامێرێکی میوزیکە**

قاهِرٌ (ج قواهر) غالبٌ . شامخ : **سەرکەوتوو ، بەرزو بڵند**

قايس قدّر بين أمرين : **پێوانەی کرد**

قَباءٌ (ج أقبية) ثوبٌ يُلبسُ فوق القميص : **کەوا**

قَبّانٌ الةٌ تُوزن بها الاشياء الثقيلة : **قەپان**

قُبّةٌ (ج قباب و قُبب) بناءٌ سقفُه مستدير مُقعّر : **گومبەت**



قُبحٌ شناعةٌ : **ناشرینیی**

قَبحَ بشع : **ناشیرین بوو**

قَبْرٌ (ج قبور) مدفن الإنسان : **گۆڕ**

قبر الميّت . دفنه : **مردووەکەی ناشت**

قُبَّرةٌ عصفورة دائمة التغريد : **چۆلەکەی بەردەوام بە جریکە**

قبس العلم . تعلّمه : **(زانستی) وەرگرت**

قَبَض المال . أعطاه إيّاه : **پارەی خستە دەستیەوە ، پارەکەی وەرگرت**

قَبَض الشيء . خلاف بسطهُ : **بەدەستییەوە گرتی**

قُبضةٌ شديد التمسك بالأشياء :**بە توندی دەست بە شتەکانەوە دەگرێ**

قِبْطٌ (ج أقباط) طائفةٌ من النّصارى الشرقيين : **قیبتی (دیانەکانی ڕۆژهەلاتیین)**



قُبطانٌ قائدُ سفينةٍ : **کاپتنی کەشتی ، کاپتنی پاپۆڕ**

قبع ادخل رأسه في ثوبه : **سەری خستە ناو جلەکەی**

قُبعةٌ غطاءٌ للراس : شەبقە ، کڵاو

قبقابٌ (ج قَباقِيب) حذاء من خشب ،كثير الكلام ،كذّاب: قاپقاپ ،زۆربلێ ، درۆزن

قُبلٌ (ج اَقْبال) مُقدَّمُ كلّ شيء ، سَفْحُ الجبل : پێشەوە ، قەدپاڵی چیا

قبلٌ طَاقَة : وزە

قَبل الخبر ، صدَّقه : هەواڵەکەی بە ڕاست دانا

قَبل الشيء ، اخذه راضياً : بە شتەکە ڕازی بوو

قِبلةٌ الكعبةُ ،جهةٌ : ڕووگە ، لا



قُبلةٌ(ج قُبل) لثمةٌ ، كفالة: ماچ ، دەستەبەری

قبْوٌ بناءٌ تحت الأرض : ژێر زەمین

قَبولٌ اخذُ الشيء عن رِضا : قەبوڵ کردن ، بەڕازی بوونەوە

قَبحٌ (ج قِباح و قَبْحى) بشعٌ : ناشیرین

قُبيْلَ تصغير قبْل اي بزمنٍ قليل : کەمێك بەر لە ئێستا

قَبيلةٌ (ج قَبائل) ابناءُ اب اوْ جدّ واحد : تیرە ، هۆز

قَبيلةٌ صخْرةٌ على راس البئر : بەردی سەربیر

قِتالٌ حربٌ :جەنگ

قتّالٌ مميتٌ ، كثير القتل : کوشندە ، قڕکەر

قَترٌ قدرٌ : ئەندازە

قِتلٌ (ج اقْتال) مُقاتِل ، شجاع ، نظير :جەنگاوەر ، ئازا ، وێنە

قَتيلٌ (ج قتْلى و قُتلاء و قتالى) مقتول:کوژراو

قُثاء و قِثاء نوع من الخُضار يشبه الخيار: ترۆزی



قحط المطرُ ، احتَبس : بێ بارانی بوو

قحف المطرُ ، اشتدَّ فجأة : باران بە لێزمە باری ، داپرشاند

قحف الرمّانة ، قشرها : هەناری داکوتی

قحِل الشيءُ ، يبس : شتەکە وشك بوو

قَدٌّ (ج قُدود و قِداد) قامة الرجُل ، سوط : بالای پیاو ، قامچی

قَدَّ الشيء ، شقّه ، قطعه طُولاً : کەرتی کرد ، بەدرێژی بڕی

قِداحَةٌ صناعة الأقداح : پیشەسازی پەرداخ

قُدّاسٌ (ج قَداديس) صلاة عند المسيحيّين : نوێژی دیانەکان

قَداسَةٌ طَهارة ، لقب "بابا" في الكنيسة : پاکژی ، نازناوی باپایە لە کڵێسەدا

قُدّامَ امام : پێشەوە



قَدَحٌ (ج أقداحٌ) إناء يُشرب فيه : پەرداخ

قَدَحَ طعن فيه ، عابه : تانەی لێدا ، لەکەداری کرد

قدحَ بالعود ، حاول إخراجَ النار منه : هەوڵی داناگری بە دار بکاتەوە

قِدْرٌ (ج قُدور)إناءٌ من فخّار : مەنجەڵ

قدرَ على الشيء ، قوي عليه ، توانی ئەنجامی بدات

قدرَ الله ، عظّمه : خوای بەمەزن دانا

قدَّر الشيء بالشيء ، قاسه به ، قدر : شتەکەی بە شتەکە گرت ، پێوای

قدر الشيء بالشيء ، قاسه به : شتەکەی بە شتەکە گرت

قدرٌ (ج أقدار) قضاء الله في عباده، مقدارُ الشيء : قەدەری خوا ، ئەندازەی شتێك

قُدْرةٌ  طاقة ، غِنىً:  توانا ، دەوڵەمەندی

قُدسٌ  قدحٌ صغير :  پیاڵە



قُدُمٌ  مُضيٌّ إلى أمام :  هاتن ، چوونە پێش

قدمٌ  (ج أقدام و قدام) رجلٌ :  پێ

قِدمٌ  مُضيُّ زمان طويل على وجود الشيء :کۆن

قدِمٌ  ما غلُظ من الأرض  زبری ونەستوری لەزەوی



قِدَمٌ  زمان قديم :  لە کۆنەوە

قدمَ المدينةَ ، دخلها :  چووە ناو شارەکەوە

قدِمَ  على الأمر ، أقبل عليه :  ڕووی لەکارەکە کرد

قدمَ القوم : سبقهم ، شجُع :  پێشکەوت ، ئازابوو

قدُمَ  صار قديماً :  کۆن بوو

قُدْوَةٌ  أُسوةٌ :  پێشەنگ

قُدُّوسٌ من أسماء الله الحسنى:یەکێکە لەناوە جوانەکانی پەروەردگار(زۆرپیرۆز)

قدُّومٌ  (ج قُدُم و قدائم) آلةٌ تستخدم للنحتِ والنّجْر : تەشوێ (ئامێرە بۆ بڕینەوەی دارو پەیکەر تاشین)

قديدٌ  لحمٌ مقطّع طولاً ومُجفّف ، ثوبٌ بال :  پارچە گۆشتی وشك کراو ، جل و بەرگی کۆنەو ڕزیو

قديرٌ من اسماء الله الحُسنى ، ذو قُدْرة :  ناوێکی جوانی خوایە  ، بەتوانا

قديمٌ (ج قُدماء و قُدامى و قدائم) ما مضى على وجوده زمانٌ طويلٌ :  کۆن

قَذارةٌ (ج قذارات) وسخٌ :  پیسی

قذِعٌ  فاحشٌ قبيحٌ  :  جنێو فرۆش

قذفَ  تكلّم من غير تدبُّر :  قسەی دەرپەڕاند

نَدْوَةٌ جماعة . نادٍ ، مجلس ، مُشاورة : کۆمەڵێك ، یانە ، دانیشگە ، پرس و ڕاوێژ ، گفتوگۆ

نَدَّى بَلَّل : تەڕیکرد

نَدِیمٌ (ج نِدام و نُدَماء و نُدْمان) رفیقٌ . مُصاحِب ، مُجالِس علی شرابٍ : هاوڕێ ، هاوەڵ ، هاودەمی مەی خواردنەوە

نَذالةٌ حقارةٌ : سووکیی

نَذْرٌ (ج نُذُور) ما یُوجِبه الإنسان علی نفسه : نەزر

نَذَرَ أوجب علی نفسه :نەزری کرد



نَذْلٌ (ج أنْذال و نُذُول) حقیر: سوکو ڕیسوا

نَرْجِس نبات طیِّب الرائحة : نێرگز

نَرْد طاولة الزّهر : یاری تاوڵە ، زار

نِزاعٌ خصومة ، حالة المُشرف علی الموت : ناکۆکیی ، سەرە مەرگ

نِزالٌ حَرْبٌ :شەڕ

نَزاهةٌ عِفَةٌ . استقامة : پاکی ، بەردەوامی

نَزَحَ بَعُدَ . هاجر : دوورکەوتەوە ، ئاوارەبوو

نَزَعَ إلی أهله . اشتاق إلیهم : بیری کەس وکاری کرد

نَزَعَ رمی ، عزل ، جذب : هاویشتی ، جیاپکردەوە ، ڕاپکێشا

نَزَعَ عن الشيء : کفَّ : وازی لە شتەکە هێنا

نَزَفَ استخرج . أنفد . قطع : دەرپهێنا ، تەواوی کرد ، بڕی

نَزْفٌ سیلانُ دمٍ : خوێن بەربوون

نَزَّلَ الشّيء . أنزله : شتەکەی هێنایە خوارەوە

نَزَّلَ القوم ، أحلَّهُم المنازل : نیشتەجێی کردن



نَزَلَ حلَ بهِ ضَيْفاً : دابەزی بە میوانیی

نُزُلٌ (ج أنْزال) منزل ، فُندق : مالٌ ، میوانخانە ، هۆتێل

نَزْلَةٌ (ج نَزَلات) مرضٌ : ئەنفلۆنزا ، سەرمابوون

نَزَّهَ طهَّر : پاكیكردەوە

نَزِهٌ عفیف : پاك و بێگەرد

نُزْهَةٌ (ج) تنزُّهٌ : سەیران

نَزِيفٌ سيَلانُ الدمِ بكثرة : خوێن بەربوونی زۆر

نَزِيهٌ (ج) عفيف ، مُستقيم : پاك و بێگەرد ، ڕێك و ڕاست

نساءٌ جمع إمْرأة : ئافرەتان

نَسَبَ ذكَرَ نَسَبَهُ : باسی ڕەچەڵكی كرد

نَسَبٌ (ج) قَرابَةٌ : خزم

نِسْبَةٌ (ج) قَرابَةٌ : ڕێژە

نَسَجَ حاكَ ، نظَّم ، لخَّص ، زوَّر : چنی، ڕێكی خست ،پوختی كرد، ساختەی كرد

نَسَخَ نقَل ، أزالَ ، ابطل : كۆپی كرد ، سڕییەوە ، بەتاڵی كردەوە

نَسْخَةٌ (ج) منسوخٌ عنه : كۆپییەك

نَسْرِينٌ وردٌ أبيضُ : گوڵە نەسرین

نَسَفَ قلع ، غربل ، نفض : هەڵی كەند ، لە بێژینگیدا ، تەكانی

نَسفَ فرَّق ، فجَّر : جیایكردەوە ، تەقاندییەوە

نَسقٌ ما كان على طريقة نظام واحد : ڕێك وپێكی

نُسُكٌ عبادةٌ : خواپەرستیی

نَسُكَ الرجلُ . اصبَح ناسكاً : **پیاوەکە بوو بە خواپەرست**

نَسَلَ الصُوفَ أو الريش، اسقطه : **توك و پەڕەکەی فڕێدا ، خستییە خوارەوە**

نسلَ ولد ، كثُر أولاده : **منالی بوو ، مندالی زۆر بوو**

نسمَ تحرك ، هبَّ : **جوڵا ، هەڵیکرد**

نسمةٌ (ج نسمات و نسم) ضيق النفس ، ربْوٌ : **تەنگە نەفەسی، نەخۆشی ڕەبوو**

نسناسٌ جوعٌ شديد : **برسێتی زۆر**

نسوَةونَسوَة نساء : **ئافرەتان ، ژنان**

نَسيٌ (ج أنساء) ما يُنسى : **لەبیرکراو**

نسْيانٌ فقدانُ ذِكر الشيء : **لەبیرچوونەوە**

نسيبٌ (ج أنسباء و نُسباء) قريبٌ ، مُناسب ، شريف : **خزم ، گونجاو ، خانەدان**

نسيجٌ (ج نُسُج) منسوج : **چنراو**

نسيمٌ (ج نِسام) ريحٌ ليّنةٌ ، رُوحٌ ، صَلابة : **شەماڵ ، ڕوح ، ڕەقی**

نشءٌ (ج نشا) نسلٌ ، صغار الحيوان و الإنسان : **منالٌ ، بێچوو**

نشأَ حدث ، تجدَّد ، ترعرع ، شبَّ ، نما: **ڕوویدا ، تازەبۆوە ، گەورەبوو ، گەنج بوو ، گەشەی کرد**

نشاءٌ مادَة تُستخرج من الحنطة : **نیشاستە**

نشاطٌ سُرعة في العمل : **گورج وگۆڵیی**

نشّافٌ نشّاشٌ ، جفّاف : **کاغەزی مەرەکەب کێش، وشکی**

نشّالٌ لصٌّ : **دز**

نشب ثار ، اشتبك ، اشترى : **هەڵچوو ، تێکئاڵا ، کڕی**

نشر بسط ، أذاع ، نجر : **ڕایخست ، بڵاویکردەوە ، داری بڕییەوە**

نشر هبَّ : **هەڵیکرد**

نشر الشجرُ نشوراً ، أورق : **گەڵاکانی دارەکە بڵاوبۆوە**

نَشْرَةٌ (ج نَشرات) نسيمٌ ، بيانٌ منْشور : با ، بڵاوكراوە

نَشَطَ الحبْل : عقده ، طعَنَ : پەتەكەی گرێدا ، لێیدا

نشِفَ شرب ، ذهب ، انقطع : خواردییەوە ، ڕۆیی ، پچڕا

نَشِفَ جفّ عن بَلل : وشك بۆوە

نشَلَ خطف : ڕفاندی

نشَلَ الخاتم من يده ، انْتزعه : ئەڵقەكەی لە پەنجە داكەند

نَشْوانُ (ج نشاوى) سكران : سەرخۆش ، مەستیی

نَشْوَةٌ أوّل السُكر ، رائحة : سەرتای سەرخۆشی ، بۆن

نَشِيدُ (ج أناشيد) رفعُ الصّوت مع لحن : سروود

نَشِيطٌ (ج نشاط و نشاطى) ذو سُرعة في العمل : چالاك

نَصٌّ (ج نُصُوص) كلامُ المؤلف الأصلي : دەق

نَصَّ حدّد ، رفع ، أظهر : دیاریكرد ، بەرزیكردەوە ، دەریخست

نِصابٌ (ج نُصُب) مرجعٌ ، مغيب الشمس ، مقبض السكّين : بنەچە ، ئاوابوونی خۆر ، دەسكی چەقۆ

نِصابٌ العدد المطلوب بلوغه ، ژمارەی یاسایی

نَصْبٌ نوعٌ من الإعراب أشهر علاماته الفتحة : جۆرە حاڵەتێكی ڕێزمانی عەرەبی یە

نصَبَ وضع ، أثبت ، غرس : دایەنا ، جێگیریكرد ، چاندی

نصَبَ رفع : بەرزیكردەوە

نصِبَ تعب ، جدّ ، اجتهد : ماندوو بوو ، تێكۆشا ، خۆی ماندوو كرد

نصحَ الشيءُ ، صفا :شتەكە بێگەرد بوو

نصَحَ لفلانٍ : أخلص له المودّة : لە ئامۆژگاریەكە بۆیدڵسۆزبوو

نُصحَ وعظَ : ئامۆژگاری

نصرَ اعان ، اعطى : یارمەتیدا ، پێیدا

نُصرٌ ناصرٌ ، مُعین : سەرخەر ، یارمەتیدەر

نَصرٌ فوزٌ : سەرکەوتن

نصرانيٌّ (ج نصارى) مسيحيٌّ : دیان

نَصرانيّةٌ دين النّصارى : ئاینی دیانەکان

نُصرَةٌ عونٌ ، مطر غزير : یارمەتیدان ، بارانی زۆر

نَصفَ الشيء : قسمهُ : شتەکەی کردە نیوە

نَصلٌ (ج نصال و انصال و نُصول) حديدة الرُمح : سەرە ڕم

نصيبٌ (ج انصبة و نُصُب) حصّةٌ من الشيء ، حظٌ ، شركٌ منصوب ؛ بەش ، شانس ، تۆڕی دانراوە

نصيحةٌ (ج نصائح)وعظَ : ئامۆژگاری

نصيرٌ (ج انصار و نُصراء) مُساعد : یارمەتیدەر

نضارَةٌ نُعومة ، حُسْنٌ ، لطفٌ : ناسکیی ، جوانیی ، میهرەبانیی

نِضالٌ بفاع ، قِتال ، كفاح : بەرگری ، جەنگ ، خەبات

نَضبَ غار ، نفد ، غاب : ڕۆچوو ، بەسەر چوو ، بزر بوو

نضبَ قلّ ، مات : کەم بۆوە ، مرد

نَضجَ ادرك ، اكتمل : پێگەیی ، تەواو بوو

نضحٌ (ج نُضوح و انضحة) ماءٌ يُرشُّ به الزّرْعُ :ئاو ڕشاندن

نضدٌ (ج انضاد) ما نُضّد من متاع البيْت ، شرفٌ ، عزٌّ :کەڵەکە بوو ، پلەوپایە ، شکۆ

نَضر نعِم ، حسُن ، لطُف : ناسك بوو ، جوان بوو ، نەرم و نیان بوو

نطّ فرّ ، وثب ، ذهب : رایکرد ، بازیدا ، ڕۆیشت

نطر حرس ، حفظ : نێشکی گرت ، پاراستی ، پاسەوانیی کرد

نطق تكلَّم : قسەی کرد



نُطْقٌ لفظ ، كلام : وشە ، قسە

نظارةٌ آلة للنظر تقرّب الأشياء البعيدة: چاویلکە

نظافةٌ نقاوةٌ من الوسخ : پاك وخاوێنیی

نظامٌ (ج نُظُم و أنْظمة) ترتيب ، منهج ، طريقة : ڕێکخستن ، ڕێباز ، ڕێگە

نظامٌ خيط يُنظم فيه اللؤلؤ : داوی ملوانکەی مرواری

نظاميٌّ خاضعٌ لنظام :ڕێك و پێك ، بەیاسایی

نظر ابصر ، تأمّل بعينه ، تفكر :بینی ، لێی وردبۆوە ، بیری کردەوە

نظْرةٌ لمْحةٌ ، عيْنٌ ، رحمة : نیگایەك ، لەکەدار ، بەزەیی

نظريّةٌ (ج نظريّات)رأيٌ ، اجتهاد :بیردۆز ، ڕاوبۆچوون ، خۆ ماندووکردن

نظم جمع ، ألف : کۆیکردەوە ، ڕێکی خست



نظّم رتّب : ڕێکی خست

نظيرٌ (ج نُظراء)مُساو ، مثيل : یەکسان ، هاوشان

نظيفٌ (ج نُظفاء) نقيٌّ : پاك ، خاوێن

نُعاسٌ لحظات النوم الأولى : وەنەوز

نعامةٌ (ج) طائر كبير الجسم طويل العنق : باڵندەی وشتر مرخ ، نەعامە

نعْتٌ (ج) صفةٌ : سیفەت

نعت وصف : وەسفی کرد

نعت الكلمة ، أتبعها بنعت : وشەی هاوەڵناو

نعْجةٌ (ج) أُنثى الضأن : مەڕ

نعس أخذه النومُ : وەنەوزیدا



نعْشٌ سرير الميت : **تابوت (دارەبازە)**

نعْلٌ (ج) حذاء : **نەعل (پێلاو)**

نعْم فعل من أفعال المدح **:چەند باشە**

نعم طاب ، لان ، اتسع **:باش بوو ، نەرم بوو ، فراوان بوو**

نعمٌ (ج أنعام) جمالٌ ، بقرٌ ، غنمٌ : **وشتر ، مانگا ، مەڕ**

نعْمةٌ تمتُّعٌ ، تنعُّمٌ ، حُسنٌ **:چێژ ، خۆشی ، جوانی**

نعْمةٌ (ج نعم و انْعُم) ما أُنْعِم به من رزق أو مال : **پێ بەخشین**

نعى اخبر بالوفاة : **هەواڵی مردنی ڕاگەیاند**

نعيقٌ صوت الغراب : **قرەقڕی قەلەڕەشکە**

نعيمٌ رغد العيش : **خۆشگوزەرانیی**

نغّص كدّر : **لێڵی کرد**

نفث رمى ، بصق ، ألقى : **هاویشتی ، تفی کرد ، فڕێیدا**

نفث سحر ، نفخ ، أظهر : **جادووی کرد ، فوی پیاکرد ، دەریخست**

نفْحةٌ (ج نفحات) عطيُة ، دفعةٌ ، نسْمة ، **بەخشین ، پالپێوەنان ، شنەی با**

نفخ بفمه : أخرج منه الريح : **فوویکرد**

نفختِ الريحُ : هبّت بغتةً : **با هەڵیکرد**

نفْخةٌ امتلاء البطن من الطعام : **سك ئاوسان**

نفد فني ، فرغ ، انقطع : **لەناوچوو ، بەتاڵ بوو ، پچڕا**

نفّذ الحكم ، أجْراهُ حسب منطوقه : **بڕیارەکەی جێبەجێکرد**

نفرٌ (ج أنفار) جماعة من الناس : **کۆمەڵە خەڵکێك ، کەسێك ، یەکێك**

نفر هجر وطنه : **وڵاتی جێهێشت**

نفر من الشيء : فزع ، انقبض : **لە شتەکە ترسا ، هاتەوەیەك**

نفّس فرّج ، لطّف ، رغّب : **کردیەوە ، هێواشی کردەوە ، پاڵی پێوەنا**

نَفَس غلا : بەنرخ بوو

نَفْسٌ (ج أنْفُس و نُفُوس) رُوحٌ ، عيْن ، دمٌ : ڕوح ، کەس، خوێن

نَفْسٌ عظمة ، همَّة : گەورەیی

نَفَسٌ (ج أنْفاس) نسيم الهواء ، مُهْلة ، ما يخرج من الإنسان من هواء : شنەی با ، ماوە ، هەناسە

نُفَساء (ج نفاس و نُفَس و نُفْس) إمْرأة ولدتْ حديثاً : ژنی زەیستان ، ئەو ئافرەتەی تازە منداڵی بووە

نَفَشٌ صُوفٌ منفوشٌ ، متاع متفرِّق :خوری هەڵوەشاوە ، کەل وپەلی جۆراوجۆر

نَفَضَ حرَّك ، أسقط : جوڵاندی ، خستی

نَفَطَ عطس ، غلْ ، صوَّت : پژمی ، کوڵا ، دەنگی لێوەهات

نَفَعَ افاد ، اصاب : سوودی گەیاند ، پێکای

نَفْعٌ فائدة : سوود

نَفَقَ نفد ، فني ، قلّ : نەما ، لەناوچوو ، کەمبۆوە

نَفَقٌ (ج انْفاق) حفرة في الأرض : تونێل

نَفَقَةٌ (ج نفقات و انْفاق) ما يُنْفَق من المال : خەرجیی

نُفُوذٌ سُلطةٌ ، جاه : دەستەڵات ، شکۆمەندی

نَفِيرٌ (ج انْفار) جماعةٌ ما دون العشرة من الرجال ، بُوقٌ يُنْفخُ فيه : چەند پیاوێك ، کەرەنا

نَفيسٌ ثمينٌ ، رفيعٌ : گرانبەها ، بەرز

نقَّ الضفدعُ ، صات : بۆقەکە خوێندی

نقابةٌ تجمُّع العمَّال أو أصحاب المهن في هيئاتٍ : سەندیکا

نقاهةٌ حالة المريض بعد شفائه : چاکبوونەوە لە نەخۆشیی

نَقاوَة الشَيء ، خيارهُ . خُلاصتُه : **هەڵبژاردە ، پاڵفتە**

نقَبَ الحائط ، خرقه : **دیوارەکەی کون کرد**

نقَبَ الأخبار ، بحث عنها ، أخبر بها : **بەدوایدا گەڕا ، بەهۆیەوە ڕایگەیاند**

نقَّحَ الكلام ، اصلح الكلام ، هذّبه : **قسەکانی باش کرد ، قسەی پوخت کرد**

نَقِدَ الضِرْسُ ، تأكل و انكسر السنْ : **ددانی کلۆر بوو ، ددانی شکا**

نَقْدٌ (ج نُقُود) عُمْلة : **دراو**

نَقَّرَ لقط ، سهَّلَ ، بحث : **هەڵی گرتەوە ، ئاسانی کرد ، لێی کۆڵیەوە**

نَقَرَ خرق ، ثقب ، كتب : **بڕی ، کونی کرد ، نووسی**

نقَشَ لوّن ، حفر ، استخرج : **ڕەنگی کرد ، هەڵی کەند ، دەریهێنا**

نَقْشٌ (ج نُقُوش ) اثر في الأرض ، ما نُقش على الشيء : **شوێنەوار ، نیگار**

نَقَصَ قلّ : **کەمی کرد**

نُقْصان قلّة : **کەمی**

نَقَضَ نَكث ، نَبذَ : **هەڵی وەشاند ، پشت گوێی خست**

نَقَضَ افسد ، هدم : **تێکیدا ، ڕوخاندی**

نَقَّطَ الشيء بالحبْر ، لطخه به ، وضع نقطة على الحرف : **شتەکەی لە مەرەکەب هەڵکێشا ، خاڵی لەسەر پیت دانا**

نُقْطَةٌ (ج نُقط و نقاط) علامة فوق الحرف او تحته ، جزءٌ يسير من الماء : **خاڵ ، دڵۆپە**

نقَعَ اجتمع ، روي ، نحر : **کۆبۆوە ، ئاویدا ، کوشتییەوە**

نقلَ حوَّل ، روى ، اصلح : **گواستی یەوە ، گێڕایەوە ، چاکی کردەوە**

نقْمَةونقْمَة انتقام : **تۆڵە**

نقى نظّف : **پاکی کردەوە**

نَقيٌ (ج انقاء) مخ العظم : **مۆخی ئێسک**

نَقِيبٌ لسان الميزان ، مزمار : **زمانەی تەرازوو ، شمشاڵ**

نَقِيبٌ رتبة في الجيش : **نەقیب پلەیەکە لە سوپادا (سێ ئەستێرەی هەیە)**



نَقِيصَةٌ (ج نَقائِص) عَيبٌ : **ناتەواوی**

نَقِيضٌ مُعاكِسٌ :**دژ ، پێچەوانە**

نَقِيقٌ صوت الضفدع وبعض الحيوانات الأخرى : **قیڕەی بۆق و هەندێ گیانداری تر**

نَكْبَةٌ (ج نَكَبات) مصيبة : **کارەسات**

نَكَتَ في قوله : جاء بالنُّكت : **قسەی خۆشی کرد**

نُكْتَةٌ (ج نُكَت و نِكات) كلامٌ لطيف : **قسەی نەستەق**

نُكْرٌ (ج أنْكار) دهاءٌ ، ذكاء : **وریایی ، زیرەکی**

نَكِرَةٌ (ج نَكِرات)غير معروف ، مُهمَّش :**نەناسراو ، پشت گوێخراو**

نَكَسَ رأسَه : طأطأهُ من ذلٍّ : **سەری خۆی شۆڕ کرد**

نَكَشَ بحث ، أذهب ، فرغ : **لێی کۆڵییەوە ، لای برد ، بەتاڵی کرد**

نَكَلٌ قويٌّ : **بەهێز**

نِكْلٌ (ج أنْكال و نُكُول) قَيْدٌ شديد ، حديدة اللِّجام : **کۆت و بەندی بەهێز ، ئاسنی لغاو**

نَكْهَةٌ رائحة الفم : **بۆنی دەم ، تام**

نَما زادَ ، كَثُرَ :**گەشەی کرد ، زۆربوو**

نَمّامٌ واشٍ ، عطرٌ : **دوو زمان ، گوڵاو**

نَمَسَ السِرَّ : كتمهُ : **نهێنیەکەی شاردەوە**

نَمَشَ كذَبَ ، نَمَّ : **درۆی کرد ، دوو زمانیی کرد**

نَمَطٌ (ج أنْماط و نِماط) أسلوب ، طراز ، صِنْفٌ : **شێواز ، جۆر ، پۆل**

نمَقَ كتب ، حسَّن ، لطم : نووسی ، جوانی كرد ، زللەی لێدا

نملٌ مكانٌ كثير النّمل ، ماهرٌ : شوێنی زۆر بە مێروستان ، لێهاتوو



نمْلٌونَمْل جنس من حشرات : مێرووله

نُمْنُمٌ قمْلة صغيرة : ئەسپێی چنكنە

نمُوذَجٌ (ج نمُوذجات و نماذج)مثالُ الشيء : نمونە

نميمة (ج نمائم) وشايةٌ : دوو زمانیی

نهارٌ (ج أنْهُر و نُهُر) من الصبح إلى المغرب : رۆژ

نهايةٌ آخر الشيء : كۆتایی

نهب أخذ قهْراً :تاڵانی كرد

نهَجَ سلك ، أوضحَ :رێی گرتە بەر ، ڕوونی كردەوە

نهْرٌ سعةٌ ، نَهْرٌ ، ضياء : فراوانی ، ڕووبار ، ڕووناكی

نهرٌ واسع : فراوان

نهر سالَ ، زجر ، طرد : لەبەری ڕۆیشت ، سەركۆنەی كرد ، دەری كرد

نهش الشيءَ ، عضَّه : قەپاڵی لە شتەكەدا

نهشةُ الحيّة . لسعته : مارەكە گەستی ، مارەكە پێی وەدا

نهض قام ، أسرع ، استعدَّ : هەڵسا ، پەلەی كرد ، ئامادەبوو

نهْضةٌ (ج نهاض و نهضات ) طاقةٌ ، قوّةٌ ، نهوضٌ بعد سقوطٍ :وزە ، هێز ، هەستانەوە دوای كەوتن ، هەڵسانەوە

نهمٌ إفراطٌ في تناول الأكلِ : زۆر خۆری

نهمٌ شرهٌ : چڵێس

نهم في الأكل ، شره :زۆری خوارد

نهىً (ج نُهْية) عقْل : هزر

نهيقٌ صوت الحمار :زەڕەی كەر

نَوالٌ عطاء ، نصيب ، صواب : بەخشین ، بەش، ڕاست

نُوْبَةٌ (ج نُوب) مصيبة شديدة :كارەسات

نَوْرٌ (ج أنْوار) زَهْرٌ : خونچە

نُورٌ (ج أنْوار و نيران) ضوءٌ ، علامة ، أثرٌ : ڕوناكی ، نیشانە ، شوێنەوار

نَوَرٌ غجرٌ : قەرەج ، دۆم

نَوْعٌ (ج أنْواع) جِنسٌ ، صِنفٌ ، نمطٌ : ڕەگەز ، پۆل ، شێواز

نَوَّعَ ضرب ، حرّك : لێیدا ، جوڵاندی

نَوَّعَ الشيءَ : جعله أنواعاً : شتەكەی جۆراو جۆر كرد

نَوْعِيَّةٌ كَيْفِيَّةٌ : چۆنێتی



نَوْلٌ (ج أنْوال) خشبة الحائك : داری تەون

نَوَّمَ أنامَ : خەواندی

نَوى قصد ، عزم ، حفظ : مەبەستی بوو ، ویستی ، پاراستی

نَيْء غير ناضج : پێ نەگەیشتوو ، كاڵ ، خاو

نِيابَةٌ عملُ النائب ، وكالة : جێگری ، بریكاری ، لەجیاتی

نِيَّةٌ (ج نيّات) قَصْدٌ ، أمرٌ ، حاجة : مەبەست ، كار ، پێویستی

نيرٌ(ج أنْيار و نيران) خشبة عُنُقِ الثَّور للحراثة : نیری گاجووت

نَيِّرٌ مضيءٌ : ڕووناك



نيل نهرٌ في مصر ، سحاب ، نبتة لونها أزرق (نيل) : ڕووبارێكە لە میسر ، هەور ، ڕووەكی چوویت (شینە)

نيلُون مادّة تُصنع منها الثياب : نایلۆن، (مادەیەكە جلی لێ دروست دەكرێت)



## باب الها . بەشی پیتی (هاء)

هـ الحرف السادس و العشرون من حروف الهجاء :پیتی بیست و شەشەمینە لە ڕیزبەندی پیتە هیجائییەكان

هاء بنفسه إلى المعالي : رفعها . بالضيف : فرح بە:خۆی بەرز كردەوە ، بە میوانەكە خۆش حاڵ بوو

هائِبٌ خائف . حذِرٌ : ترساو ، ئاگادار

هائجٌ ثائرٌ . مُضطرب . غضِبٌ : هەڵچوو ، شێرزە ، تووڕە

هائِلٌ مُخيف . مُفزِعٌ : ترسێنەر ، سامناك

هائِلٌ كثيرٌ : زۆر



هائمٌ (ج هُيّم و هُيّام) مُتحيّر : سەرسوڕماو

هابٌ حيّةٌ : مار

هاب خاف . وقّر : ترسا ، شكۆدار بوو

هابطٌ مهزول . ساقطٌ :لاواز ، كەوتوو

هات اعطني : بمدەرێ

هاتفٌ تلفون : تەلەفۆن

هاجَ ثارَ،تحرَّك،اضطرَب : هەڵچوو،جولا، شڵەژا

هاجِدٌ (ج هجود و هُجَّد) نائمٌ بالليل ، من يُصلّي في الليل : خەوتو بەشەو ، شەونوێژکار

هاجَرَ خرجَ من بلده إلى بلدٍ آخر : کۆچی کرد ، سەفەری کرد

هاجِرة (ج هاجرات ، هَواجر) حرّ شديدٌ : قرچەی گەرما

هاجِريٌّ حَسَنٌ ، مُلازم الحضَر : باش ، شارنشین

هاجِسٌ (ج هَواجِس) ما خطر بالبال : ئەندێشە

هاجِعٌ (ج هُجُوع و هُجَّع) الذي ينام ليلاً : نوستوو

هاجى هجا كلٌّ منهما الآخر : یەکتریان داشۆری

هادَ ابتعد عن الضلال ، تاب : ڕێی ڕاستی گرت ، تۆبەی کرد

هادِرٌ (ج هدرة) ساقِطٌ ، لبنٌ رائب : کەوتوو ، ماست

هادِفٌ غريب ، ذو هدف : نامۆ ، خاوەن ئامانج

هادَن صالح ، وادع : ئاشتەوایی کرد ، لەگەڵی ڕێککەوت

هادى اهدى كلٌّ منهما شيئاً إلى الآخر : دیارییان دا بە یەکتری

هاداهُ جعله يتمايل في مشيته :لە ڕۆیشتندا ئەولاو ئەلای پێکرد

هادِىءٌ ساكنٌ : هێمن و لەسەرخۆ

هارِبٌ فارٌّ : ڕاکردوو

هارَش الرجُل ، خاصمَهُ : هەڕەشەی لە پیاوەکە کرد

هارَش الكِلابَ ، أغرى بعضها ببعض : سەگەکان پەلاماری یەکتریاندا

هازَل مازَح : گاڵتەی کرد

هازِئٌ ساخِرٌ : گاڵتەجی

هاش ثار ، اختلط : وروژا ، تیکەڵی کرد

هاصِرٌ حيوان يكسر عظام فريسته : درندەی تێك شكێنەر

هاضوم دواء مساعد على هضم الطعام : دەرمانی هەرسكەر

هالَ خاف ، صعب : ترسا ، دژوار بوو

هالٌ سَرابٌ، تراويلكە

هالَةٌ دارة القمر : خەرمانەی مانگ

هالِكٌ (ج هَلْكَى و هوالك) فانٍ : فەوتاو

هام تاه ، عطش : دیار نەما ، تینوو بوو

هامَةُ (ج هام و هامات) أعلى الراس ، زعيم القوم : تەوقە سەر ، سەركردە ، سەرۆكی هۆز

هامَةٌ جماعة الناس ، نوع من البُوم الصغير : كۆمەڵێك خەڵك ، كونە پەپو

هامِدٌ (ج هوامد) ميتٌ ، ساكن ، يابِسٌ : مردوو ، خامۆش ، وشك

هامِر سيّال ، كثيرٌ : هەڵڕێژ ، زۆر

هامِس سارّ : چرپاندی

هامِشٌ (ج هوامش)حاشية الكتاب : پەراوێز

هامَش عاجل ، حثّ : پەلەی كرد ، هانی دا

هان ذلّ ، ضَعُفَ ، سَكن : ڕیسوا بوو ، لاواز بوو ، وەستا



هانَ سهُل ، لان : ئاسان بوو ، نەرمی نواند

هاوُنٌ (ج هاوُنٌ و هاوُونٌ و هواوين) وعاءٌ مُجوّفٌ يُدقّ فيه : دەسك و ئاونی شت كوتین ، ئاون

هاونٌ نوع من المدافع : چەكی هاوەن

هاون الرجلُ نفسَه : رفق بها : نەرم و نیان بوو لەگەڵ نەفسی خۆیدا

هاوِيةٌ  حُفرة عميقة ، جهنَم :چالی قوڵ ، دۆزەخ

هَبَّ  ثار ، استيقظ :هەڵی کرد ، بێداربۆوە

هَبَّ النجمُ : طلع : ئەستێرەکە هەڵات

هَباءٌ (ج أهباء و و أهبِيَة) غُبارٌ : تۆزو خۆڵ

هَبّارٌ قردٌ كثيرُ الشَعر، صارم، مەیمونی توکن، بەزەبر

هَبالَة  فقدانُ التمييز والتفكير : گێلیی



هَبَّبَ  خرَّقَ ، مزَّقَ : کونی کرد ، دڕاندی

هبَّةٌ  اختراق ، حقبةٌ من الدهر ، حالٌ، بڕین ، سەردەمێك ، دۆخ

هِبَةٌ (ج هِبات) عطيَّة : بەخشیش

هَبَجَ  ضرَبَ ضرباً متتابعاً :لێدانێکی یەك بەدوای یەك

هَبَرَ اللحمَ : قطعه قطعاً كبيرةً : گۆشتەکەی پارچە پارچە کرد

هَبَشَ  جمَعَ ، أصاب ، كسَبَ : کۆی کردەوە ، پێکای ، بەدەستی هێنا

هَبَطَ الوادي : نزَلَهُ ،    چووە ناو دۆڵەکەوە

هَبَلَ  صار عديم التفكير الرَصين : گێل بوو

هُبَلْ  صنم ، بتی هوبەل

هَبْهابٌ  سريع ، صيَّاح ، سرابٌ :خێرا ، هاوارکەر ، تراویلکە

هَبُوبٌ  ريحٌ تُثير الغُبار ،    تۆزو با

هُتافٌ  صوتٌ عال : هاوار ، بانگی گەورە

هَتَرَ  مزَّق ، سلَبَ :دڕاندی ، فڕاندی

هَتَفَ  صاح ، نادى ، مدَحَ :هاواری کرد ، بانگی کرد ، ستایشی کرد

هَتَكَ  خرَقَ ، فضَحَ :دڕاندی ، ئابڕوی برد

هَدَّ البيتَ ، هدَمَهُ :   خانووەکەی ڕوخاند



هجا جُوعَهُ : ذهب : **برسێتی نەما**

هجاهُ سبَّ بالشِّعْر : **هۆنراوەی داشۆرین**

هجاءُ حروف من الألف إلى الياء : **پیتە هیجائییەکان**

هِجَانٌ (ج هَجَائة) حصان : **ئەسپ**

هجدَ نام في اللّيل ، صلّى في اللّيل : **شەو نوست ، شەو نوێژی کرد**

هجرَ مال ، اعتزل : **لایدا ، گۆشەگیر بوو**



هِجْرانٌ صرمٌ ، قطعٌ : **بڕین ، بچڕان ، دابڕان**

هِجْرَةٌ خروجٌ من بلد إلى بلدٍ آخر : **کۆچ کردن**

هِجْرِسٌ (ج هَجارِس) قِردٌ ، ثعلب ، ذئبٌ : **مەیموون ، ڕێوی ، ورچ ، هرس**

هَجْسٌ صوتٌ خفيٌ : **چرپە**

هجسَ الشيءُ في صدْره ، خطر بباله : **شتێك بە دڵیدا هات**

هجعَ نام ليلاً : **بەشەو نوست**

هجمَ عليه ، وصل إليه على غفلة منه ، منه هجوم الجيوش : **گەیشتە سەری ناگای لە خۆی نەبوو ، سوپا هێرشی کرد**

هَجْمَةٌ المرّة من هجم ، أوّل ظلام الليل : **یەکجار هێرش کردن ، سەرەتای تاریکی شەو**

هجُنَ الكلامُ : كان فيه قُبْحٌ : **قسەکە ناشیرین بوو**

هُجْنَةٌ (ج هُجنٌ) قُبْحٌ : **ناشیرینیی**

هُجُومٌ انقضاض بغتةً : **هێرش**

**هَجّی** عدّدَ ، قرا ، علّم : **ژماردی ، خوێندی ، فێری كرد**

**هجيرة** فترة من منتصف النّهار في الحرّ الشديد : **قرچەی گەرمای نیوەڕوان**

**هَجينٌ** (ج هُجُنٌ و هُجناء) حقير ، غريب : **سوك و ڕیسواشامۆ**

**هَدَّ** هدم ، كسر ، هرم : **ڕوخاندی ، شكاندی ، پیر بوو**

**هَدْءٌ** طائفةٌ من الليل ، عادة : **بەشی دوایی شەو ، نەریت**

**هَدَأَ** سكن ، اقام ، مات : **ئارام بوو ، نیشتەجێ بوو ، مرد**

**هُدُابٌ** عَيِيٌّ ثقيلٌ : **گەمژەی قورس**

**هَدادٌ** رفقٌ : **نەرم و نیانی**

**هَدّارٌ** عالي الصَّوت : **دەنگ گەورە**



**هُدامٌ** دُوارٌ يُصيب الإنسان في البحر : **گێژبوونی مرۆڤ له دەریادا ، سەرسوڕان لەناو پاپۆڕ**

**هُدْبٌ** (ج أهْداب) شَعر ينبت على اشفار العينين : **برژانگ**

**هَدَّدَ** توَعّد ، أنْذرَ : **هەڕەشەی كرد ، ئاگاداری كردەوە**

**هَدَرَ** رَدَّد ، غَلى ، اضاع : **دوبارەی كردەوە ، كولا ، بە فیڕۆی دا**

**هَدَفٌ** (ج اهداف) كلّ مرتفع ، غاية ، رجلٌ عظيم : **هەموو بەرزاییەك ، مەبەست ، پیاوی گەورە**

**هِدَفٌ** جسيمٌ طويل العنق : **قەبەی مل درێژ**

**هَدَفَ** إلى الشيء : قارب : **لە شتەكە نزیك بۆوە**

**هدِلَ** استرخى : **خاو بۆوە**

**هدَلَ** الحمامُ ، صوّت : **كۆترەكە خوێندی ، گمەی كۆتر**

**هَدَمَ** نقض ، هدّ : **هەڵی وەشاندەوە ، ڕوخاندی**



هدُن سكُن ، شغل ،أرضى :هێمن بۆوه ، سەرقاڵ بوو ، ڕازی بوو

هُدْنَةٌ (ج هُدن) وقف القتال بين المتحاربين مؤقتاً : ئاگر بەست

هُدْهُدٌ (ج هَداهِد و هداهيد) طائر ذو خطوط و ألوان كثيرة، پەپووسلێمانكە

هُدُوءٌ سكينة : هێمنی

هدَى أرشد . بيِّن ، اهتدى : ڕێنوومایی كرد ، دەری خست ، ڕێگای ڕاستی گرت

هُدىً رشاد ، استقامة ، بيان : ژیری ، ڕێگەی ڕاست ، ڕوونكردنەوە

هدى العروسَ إلى زوجها ، زَفَها إليه : بوكی بۆ زاوا گواستەوە

هدْيٌ ما أُهدي إلى الحرم من النَعَم ، طريقة : ئەو ئاژەڵانەی (حوشتر ، مانگا ، مەڕومالآت) دەبرێن بۆ مەككە بەمەبەستی قوربانی ، ڕێگا

هَدِيَّةٌ (ج هدايا) ما يُقدَم إلى قريب : دیاری

هديرٌ تَردُّدُ صوت الحمام في حنجرته : گمانندنی كۆتر

هديلٌ صوت الحَمام ، ثقيل ، رجلٌ كثير الشَعر : دەنگی كۆتر ، گران ، پیاوی توكن

هذَاءً تكلم بكلام غير مفهوم :ورتە ورت

هُدْب رمش : برژانگ

هذبٌ صفاءٌ ، بێ گەردو خاوێن

هذَّبَ أسرع ، خلَص ، طهرَ : پەلەی كرد ، پوختی كرد ، پاكی كردەوە

هذر خلط و تكلَم بما لا يَنْبغي : قسەی غەڵەت و پەلەتی كرد

هذر تكلَم كلاماً كثر فيه الخطأ و الباطل : قسەی نا بەجێ

هذی تكلّم كلاما غير واضح لمرض او غيره ، ورێنەی کرد



هِرٌ (ج هررة) قطّ ، سنّورٌ : پشیله

هرَّ ساء خُلقُهُ : بەدڕەوشت بوو

هرَّ الكلبُ . صات دون نباحٍ : سەگەكە لوراندی

هراً اشتدَّ ، نضج : توند بوو ، پێ گەیشت

هُراءُ كلام كثير فاسد لا نظام له، قسەی غەلەت و پەلەت



هِراوة (ج هراوى و هُرِيّ) عصا ضخمة : گۆچانی گەورە

هَرِب هرم، پیر بوو



هَرَبَ فرّ : ڕای کرد

هَرَبَ في مشيه ، أسرع : غاریدا

هَرَبٌ فرارٌ :ڕاکردن

هَرَجَ مزح : گاڵتەو گەپی کرد

هَرَجَ الناسُ ، وقعوا في فتنة : تووشی شەڕو

ئاژاوە هاتن ، کوشتن

هرس الشيء ، دقّه ناعما : شتەکەی ورد ورد کرد

هرّش بين الكلاب ، حرّش : سەگەکانی تێك بەردا ، شەڕەسەگی پێ کردن

هرّش بين الناس ، أفسد : نێوانی خەڵکی تێکدا

هَرِش صعُب : سەخت بوو

هَرْطقة بدعة في الدّين : داهێنانی خراپ لە ئایندا

هَرطوقيٌّ(ج هراطقة)من كان ذا بدعة في الدّين:بیدعەچی

هرع اليه ، مشى مُسرعا مضطربا : بەپەلە چوو بۆ لای

هرع الدمُ ، سال سريعا : خوێنی لەبەر ڕۆیی



هرم شاخ : **پیر بوو**

هرمٌ (ج أهرام و هرام) مخروط مصلّعٌ :**شێوە قوچەکی**

هرمٌ بلوغ أقصی الکبر : **پیریی**

هریء نضج کثیرا : **زۆر پێگەیشتوو ، تەواوگەیی**

هریسة نوعٌ من الطّعام : **چێشتی هەریسە**

هزّ الشّيء و بالشيء . حرّکهُ . اسرع . آغری : **جوولاندی، پەلەی کرد ، فریویدا**



هُزاةٌ يُهزأ منه : **قەشمەری ، گاڵتە**

هزارٌ (ج هزارات) طائر حسن الصوت : **بولبول**

هُزالٌ ضعفٌ : **لاواز**

هزبْرٌ (ج هزابر) ضخم . صُلب . أسدٌ : **کەتە، رەق ، شێر**

هزّةٌ المرّة من هزّ :**یەکجار لەرزین**

هزج ترنّم : **گۆرانی چڕی**

هزُرٌ قاس . أحمقٌ . مغبونٌ : **ستەمکارستەملێکراو ، گەوج**



هزلَ مزح :**گاڵتە وگەپی کرد**

هُزل ضعفَ : **لاواز بوو**

هزم العدوّ . کسرهُ : **دوژمنی شکاند**

هزیء من الشخص . سخر منه : **گاڵتەی بە کەسێك کرد**

هزیعٌ (ج هزُع) طائفةٌ من اللیل :**بەشێکی شەو**

هزیل نحیلٌ : **لەڕو لاواز**

هَزِيمَةٌ (ج هَزائم) انكسار : تێ شكان ، دۆڕان

هَشَّ تبسَّم . بشّ ، پێ کەنی ، شادمان بوو ، زەردەخەنەی کرد

هَشٌّ رَخوٌ لَيِّنٌ يقبل الكسر بسُهولة :نەرم‌وزوو دەشکێ

هَشَّ ورَقَ الشجر . خبطهُ بعصا، بە گۆچان گەڵای درەختەکەی وەراند

هَشاشٌ لَيْن :نەرم



هَشَّمَ كَسَّرَ :وردو خاشی کرد

هَشِيمٌ نباتٌ يابسٌ مُتكسِّرٌ : پوش و پەلاش

هَصَرَ كسر أمال و جذب، دفع : شکاندی ،چەمانیەوە و ڕای کێشا ، پاڵی پێوەنا

هَصُورٌ (ج هَواصر) أسدٌ : شێر

هَضَبَ الرَّجُلُ : مشى مُتمهِّلاً : پیاوەکە بەهێواشی ڕۆیشت

هَضبتِ السماءُ امطرت:ئاسمان بارانی باراند

هَضْبَةٌ (ج هضاب و هضب) تَلَّةٌ : گرد

هضم رقّ ، دقّ : تەنکی کرد ، وردی کرد

هَضْمِيٌّ ما يساعد على هَضْمِ الطَّعام : ئەوەی یارمەتی هەرس کردن دەدات

هَضُومٌ (ج هُضُمٌ) كلّ دواء يهضم طعاماً : دەرمانی هەرسکەر

هَطَلَ المطرُ : نزَلَ متتابعاً : باران باری

هَفَّ أسرع في مشيه : بەپەلە ڕۆیشت

هفا سقط . انحرف . جاع ، کەوت ، لایدا ، برسی بوو

هفا ارتفع . خفق . طاش . طرب . خفَّ . طرد : بەرزبۆوە ، ترپە ترپی کرد ، هەڵەشەیی کرد ،دڵخۆش بوو ، سووك بوو ، دەریکرد

هفوة (ج هفوات) سقطة ، غلط : كەوتن ، هەڵە

هلّ ظهر ، فرح ، صاح : دەرکەوت ، شادبوو ، هاواری کرد

هلْ حرف الاستفهام : ئایا؟ ، ئامرازیپرسیارە

هلاّ كلمة تحضيض : (بۆ ، دەی) وشەیەکە بۆ هەڵنان و هاندان

هلاكٌ موتٌ ، فناء : مردن ، لەناوچوون



هلالٌ (ج أهلّة و اهاليل) القمر ، غلامٌ جميل :

مانگ، منالی جوان ، مانگ لەکاتی پڕنەبوونی

هلّة مسْرجة ، مصباح :چرا ، گڵۆپ

هلِعَ جزِعَ : نا ئومێد ، ترساو

هلِعٌ حريص ، طمّاع : بێ داگر ، چاوبرسی

هلع جزع ، قلق ، جاع : ئارامی نەما ، دوو دڵ بوو

، برسی بوو ، ترسا

هلك ماتَ : مرد

هلّل قال: (لا إله إلا الله): تەهلیلەی کرد ، واتە وتی (لا إله إلا الله)

هلُم كلمة نداء بمعنى تعال : وەرە

هلْهل الحائكُ الثوب ، نسجه رقيقاً : جۆڵاکە جلەکەی بە تەنکی چنی

هلهلَ الشاعِرُ شعْره ، لم ينقّحْهُ : هۆنەرەکە هۆنراوەکەی پاك نوس نەکرد

هلْيُوم عنصرٌ غازيٌّ : گازی هیلیۆم

هليون نبات طريّ : گیا مارانە ، هلیۆن (جۆرە سەوزەیەکە)

همَّ حزن ، قلِق ، آذاب، خەمبار بوو ، دوو دڵ بوو ، توانییەوە

همٌّ (ج همُوم) حزْنٌ ، خەم و خەفەت

هُمامٌ (ج همام) سيّدٌ شُجاع : مەزن و بەجەرگ

همّةٌ (ج همم و همّات) عزمٌ قويٌّ : ورەی بەهێز

هَمَجٌ(ج اهْماج)جوعٌ،سوء التدبير،حمقى:برسێتی،خراپترین رێکخستن،گەوجیی

هَمَدَ طفىء : کوژاوە

هَمَرَ صبَّ ، اعطى ، هدم : داى ڕشت ، پێیدا ، ڕوخاندی

هَمْزَةٌ (ج همزات) أول حرف من حروف الهجاء : یەکەم پیتی هیجائیە

همزاتُ الشيطان : خطراتهُ :خوت خوتەی شەیتان

هَمْسٌ صوتٌ خفيّ : چرپە

هَمَشَ عضّ ، جمع ، تكلّم ، تحرّك : گەستی، کۆی کردەوە ، قسەی کرد ، جوڵا

هَمَلَ فاض ، دامَ : لێی ڕژا ، بەردەوام بوو

هَمْهَمَ تكلّم كلاماً خفيّاً : بەنهێنی قسەی کرد

هَمَى سال ، سقط : ڕژا ، کەوت

هَنَأَ صار هنيئاً سائغاً : ئاسان و سوك بوو

هِنْدامٌ حُسنُ القدّ والقوام : بەژن و باڵا جوان

هِندباء نبات يؤكل عند طبخه : ڕووەکی کاسنی ، ڕووەکی تاڵیشك

هَنْدَسَ خطّط ، صمّم : پلانی داڕشت ، نەخشەی کێشا

هَنْدَسَةٌ علمٌ يبحث في أوضاع الخطوط و أشكال : زانستی ئەندازیاریی

هُنْدُوس عالم بالأمور : شارەزا لە کاروبارەکان

هُنْدُوس جماعة من الهنود يقدّسون البقر:هیندۆسەمانگا پەرستەکان،هیندۆس

هَنيء مُريح : ئاسودە

هُنَيْهَةٌ وقتٌ قصير :کاتێکی کەم

هَواءٌ (ج أهْوية) جوٌّ ، غازٌ يُحيط بالكرة الأرضيّة : کەش ، بەرگە هەوای زەوی

**هَوائِيٌّ** نسبة إلى هواء ، سلكٌ يوصل بجهاز الراديو أو التلفزيون :**هەوایی ئالێری ڕادیۆ و تەلەفزیۆن**



**هَوَادَة** رِفْقٌ . مُحاباة :**نەرم و نیانی ، خۆشویستن**

**هَوان** ذُلٌ : **سەر شۆڕی**

**هوايَةٌ** ما يهواهُ المرءُ :**خولیا ، ئارەزوو**

**هُوَّةٌ** (ج هُوَى و هُوَ و هُوِيّ) حفرة عميقة ، فجوة : **چاڵی قوڵ ، دەلاقە**

**هَوْدَجٌ** (ج هوادج) محمل على ظهر الجمل للنساء :**کەژاوەی سەرپشتی حوشتر**

**هَوَّرَ** اوقع في خطرٍ : **خستییە ناو مەترسیەوە**

**هَوْرٌ** (ج أَهْوار) قطيعٌ منْ غنم :**مێگەلە مەڕێك ، زەلکاو**

**هَوِسَ** اضطرب . فسد ، **شڵەژا ، تێکچوو**

**هَوِشَ** ثار : **هەڵچوو**

**هَوْشَةٌ** (ج هوشات) فتنةٌ، جماعةٌ مختلطة، **ئاشووب ، کۆمەڵێکی تێکەڵ**

**هَوَّلَ** خوَّف . حمل . شغَّ : **ترساندی ، هەڵیگرت ، تیشکی دایەوە**

**هُولَةٌ** عجبٌ : **سەرسامی**

**هَوَّنَ** عليه الأمر . سهّلَهُ : **کارەکەی لەسەر ئاسان کرد**

**هُونٌ** خِزْيٌ . خلْقٌ ، **ڕیسوایی ،دروسکراو**

**هَوىً** (ج أهْواء) عشقٌ : **ئەوین ، دڵداری**

**هَوَى** سقط من علوٍ إلى اسفل : **کەوتە خوارەوە**

**هُوِيَّةٌ** حقيقةُ الأشياء المُطلقة : **ڕاستی شتەکان بە ڕەهایی**

**هُوِيَّةٌ** بطاقة معلومات الشخصية : **ئاسنامە**

**هُوَيْنَى وهُوَيْنَا** تُؤدَةٌ و رفقٌ : **هێمنی و لەسەرخۆیی**

هَيْئَةٌ  حالُ الشيء و صورتُه : شێوەو دۆخ

هَيَّأ  اعدَّ ، اصلَحَ ، ئامادەی کرد ، چاکی کرد

هَيَّابٌ  من يخافُ الناسَ :ترسنۆك

هِياجٌ  تحرّكٌ ، ثورانٌ : جولان ، هەڵچوون

هُيام  جنونٌ من العِشق ، عَطشٌ شديدٌ، ئەو پەڕی خۆشەویستی ، شێتی ئەوین ، ئەوپەڕی تینوێتی

هَيْبَةٌ  مخافة ، حَذرٌ ، وَقارٌ : ترس ، وریا ، شکۆمەندی

هَيَّجَ بينهما الشرُّ : اثارهُ : شەڕی لەنێوان هەڵگیرساندن

هَيْكَلٌ  بناءٌ مرتفع مُشرف ، تمثال ، معبد :باڵەخانەی بەرز ، پەیکەر ، پەرستگا

هيْكل العظمي: مجموع العظام التي يقوم عليها بناءُ الجسم : ئێسکە پەیکەر

هَيْمانٌ  مُحبٌ ، أشدّ الحبّ : شەیدا ، بەهێزترین خۆشەویستی

هَيْمَنَ  رَفرَف ، سيْطر : لە شەقەی باڵیدا ، زاڵ بوو

هَيْمَنَةٌ  سيطرة : زاڵ بوون

هَيِّن (ج اهوِناء و هَيِّنون) سهْلٌ ، ضعيف :  ئاسان، لاواز




## بابُ الواو ، بەشی پیتی (واو)

والحرف السابع و العشرون من حروف الهجاء : **پیتی بیست و حەوتەهەمە لە ڕیز بەندی پیتە هیجائییەکان**

وِئامٌ وفاقٌ : **سازان**

وا حرف نداء مختصّ بالنُّدبة : **هاوار**

وابِلٌ مطرٌ شديد : **بارانی بەخوڕ**

واثِقٌ مُؤتَمِنٌ به : **بڕوا پێکراو**

واجِبٌ لازِمٌ، **ئەرك**

واجِمٌ ساكتٌ ، مُطرِقٌ لشدَّة الحزن : **بێ دەنگ ، خەفەتبار**

واجَهَ قابل : **دیداری کرد**

واجِهَةٌ ما يستقبلك من الشيء : **ڕووی پێشەوە**

واحَةٌ مكان في الصحراء فيه ماء و زرع : **مێرگوزار**

واحِدٌ(ج واحِدُون) أوّل العدد ، من اسماء الله الحُسنى :**یەك ، ناوێکی جوانی پەروەردگارە**

وَأَدَ البنت ، دفنها حيّةً :**کچەکەی زیندە بە چاڵ کرد**

وادِعٌ هادِىءٌ، ساكن :**لەسەرخۆ ، هێمن**

وارَبَ خدع : فریوی دا

وارِث (ج ورثة و وُرّاث)من انتقل إليه ملكٌ أو مالٌ بعد وفاة صاحبهما . من أسماءالله الحُسنى:میراتگرناوێکی جوانی پەروەردگارە




وازَنَ ساوى :  هاوسەنگی کرد

واسِطَةٌ وسيط ، سبب :ناوەند ، هۆکار

واصَلَ الشيءَ : واظب عليه من غير انقطاع :  لەسەر شتەکە بەردەوام بوو

واضِحٌ  بيِّن : ئاشکرا

واعَدَ عاهد،  بەڵێنی دا

واعَدَاعدةُ  وعد كلٌّ منهما الآخر :  بەڵێنیان بە یەکتری دا

واعِظٌ (ج وُعّاظ) من يقوم بالنُّصح : ئامۆژگاری کەر ، بانگخواز

وافِرٌ كاملٌ : تەواو

وافَقَ صادف ، لاءم : رێك کەوت ، گونجا

واقِعِيَّةٌ  مذهب : رێبازی واقیعی

واقِعةٌ  حادثةٌ : رووداو

واقِعةٌ مصيبةٌ : کارەسات

واكَبَ الموكِب ، ركب معهم و سايرهم :لەگەڵ کۆڕەوەکەدا ڕۆیی ، لەگەڵیان ڕۆیشت

واكَبَ على الأمر ، داوم :لەسەر کارەکە بەردەوام بوو

والٍ (ج وُلاة) حاكم بلد: فەرمانڕەوا

والَى صادق ، ناصر ، تابع : هاوڕێیەتی کرد ، سەری خست ، شوێن کەوت



وباءٌ (ج اوبئة) مرضٌ منتشرٌ : **پەتا**

وبُخَ لام : **سەرکۆنەی کرد**

وَبرٌ (ج أوبار) شعر كالصوف : **تووك**

وَبْلٌ مطرٌ غزير شديد : **بارانی زۆر ، لێزمە باران**

وَتَدٌ (ج اوتاد) ما ثُبِّت في شيء : **سینگ ، داروچکەی چەقاند**

وَتَرٌ (ج أَوْتار و وتار) خيط غليظ يُشدّ بين طرفي القوس : **ژێ**

وَتيرةٌ طريقة ، فترة في العمل : **ڕێگا ، ماوەیەك لەکاردا**

وَثَبَ نهض ، قفز : **هەستاوە ، بازیدا**

وَثْبٌ قفزٌ : **بازدان**

وَثُقَ الشيء ، صار مُحكماً : **شتەکە تۆکمە بوو**

وَثَنٌ (ج أَوْثان و وُثْن) صنمٌ : **بت**

وَثَنِيٌّ الذي يعبد الأوثان : **بت پەرست**

وثِيقٌ (ج وثاق) مُحكَم : **تۆکمە**

وثيقةٌ (ج وثائق) مُستند : **بەڵگەنامە**

وجاهَةٌ جاهٌ ، شرَفٌ : **پلەو پایە ، شکۆ**

وجَبَ القلبُ ، خفق : **دڵ کەوتە تەپەتەپ**

وجْبَةٌ أكلةٌ واحدة فياليوم : **ژەمێك**

وجْبَةٌ صوت الشيء الساقط : **دەنگی کەوتنە خواری شتێك**

وجدَ اكتشف : **دۆزییەوە**

وَجَدَ اسْتغنى : دەوڵەمەند بوو

وِجْدانٌ ضميرٌ : ویژدان

وَجَعٌ (ج أَوْجاع ووِجاع) ألمٌ : ئازار

وَجِعٌ (ج وَجِعُون و وَجْعَى و وَجاعى)ذو الم : بە ئازار

وَجِلَ خاف : ترسا

وَجْنَة ووِجْنَة (ج وَجنات) ما ارتفع من

الخدَّيْن : کوڵم



وَجْهٌ (ج أَوْجُه و وُجُوه و أُجُوه) اوَّل ما

يبدو للناظر من الرأس : دەم و چاو ،

ڕوخسار

وَجْهٌ جهةٌ ، قصدٌ ونيَّة : لا ، ڕازو نیاز

وَجَّهَ ارسل ، شرَّف ، أدار : ناردی ،

شکۆدار بوو ، هەڵی سوڕاند

وَحَّدَ الشيء : جعله واحداً شتەکەی

کردە یەك ، یەکی خستەوە

وَحَّدَ الله ، قال ( لا إله إلا الله) : خودای بە تاکدانا ، وتی (لا اله الا الله)

وَحْدَةٌ إنْفرادٌ بالنَّفْس : تەنیایی

وَحْدَةٌ حال ما اتحد من الناس : یەکڕیزی

وَحْشٌ (ج وُحُوش و وُحْشان) حيوان البرّ : دڕندەی کێوی

وَحْشَةٌ خوفٌ من الخلوة : ترسان لە تەنیایی

وحْشَةٌ همٌّ ، غربة : خەم ، نامۆیی

وحل (ج أوْحال و وُحُول) طينٌ رقيقٌ : قوڕ

وحل وقع في الوحل : کەوتە قوڕەوە

وحْيٌ ما يوحيه الله إلى أنبيائه : **سرووش**

وحْيٌ كتابة وخط : **كتێب نوسين**

وحيدٌ منفردٌ : **تەنيا**

وخْزٌ قليلٌ من كلِّ شيء : **تۆزقالێك**

وَخيمٌ (ج وخام و وخامى و أوْخام) غير صحّي ، غير مناسب ، رديء : **ناتەندروست ، خراپ ، نەگونجاو**

وُدٌّ حُبٌّ : **خۆشەويستی**

وَدَّ أحبَّ : **خۆشی ويست**

وَداعٌ فِراقٌ ، توديع المسافر : **جيابوونەوە ، ماڵ ئاوايی كردن**

وَداعةٌ سَكينة ، وقار : **ئارامی ، شكۆ**

ودودٌ كثيرُ الحُبِّ ، من أسماء الله الحُسنَى : **زۆر خۆشەويست ، ناوێكی جوانی پەروەردگارە**



وَديعٌ ( ج وُدعاء) هاديءٌ : **هێمن**

وراءَ ظرف مكان بمعنى خلْفَ : **پشتەوە**

وراثةٌ إرْثٌ : **ميرات ، بۆماوەزانی**

ورِثَ انتقل إليه مالُ شخصٍ بعد وفاته، **ميراتی گرت**

ورْد (ج وُرُد و وراد) أسد ، شُجاع : **شێر ، ئازا**

ورْشةٌ جماعة العمّال و البنّائين المشتغلين في بناء : **كارگە**

ورْطَةٌ (ج ورطات و وراط) أمر شاقّ : **كاری سەخت**

ورْطَةٌ هوّةٌ عميقة في الأرض، **كەندی قوڵ لە زەويدا**

وَرَعٌ   اجتنابُ المعاصي : دووركەوتنەوە لە تاوان لەترسی خوا

وَرَقٌ  أعضاء نباتيَة تنمو على اغصان الشجر : گەڵا

وَرَقٌ(ج أوْراق و وِراق)صفائح جافَة رقيقة تُتّخذ للكتابة والطباعة : پەڕ ، كاغەز

وَرَّقَ الشجرُ ، ظهر ورقه : دارەكە گەڵای دەركرد

وَرَقَةٌ   واحدةى الورق،طينٌ تُسْتَر به حجارة الحائط :پەڕەیەك ، قوڕی سواخ دان

وَرِمَ الجلدُ : انتفخ من المرض : توشی وەرەم بوو ، لەبەر نەخۆشیی پف بووە

وَرَمٌ (ج أوْرام) انتفاخ الجلد لمرض فيه

:وەرەم



وَرِيدٌ (ج أوْرِدة و وُرُد و وُرُود) عِرْق في العنق،كلّ عرق يرجعُ فيه الدَّم من الجسد إلى القلب  :  دەماری مل ، خوێن هێنەر

وزارة منصب الوزير وعمله : وەزارەت

وَزَّعَ المالَ بينهم ، فرّقه : ماڵەكەی بۆ لێك جیاكردنەوە ، پارەكەی لەنێوانیان دابەش كرد

وَزَّعَه عليهم ، قسمه : دابەشی كرد

وَزَنَ  قدَّر ثقل الشيء وخفّته بالميزان : كێشای

وَزْنٌ (ج أوْزان) مثْقالٌ ، ما نظمتْ العرب أشعارها : كێش ، كێشی هۆنراوە

وَزِيرٌ (ج وُزراء) رجلُ دولة يُعهد إليه بعض شؤون البلاد :وەزیر

وِسادةٌ (ج وسادات و وسائد) مخدَّة : باليف ، پشتیی

وساطَةٌ عمل الوسيط :   نێوەندگیری

وِسامٌ (ج أوْسمة) نيشانٌ يعلَّق على صدر مَن يقوم بأعمال : مەدالیای ڕێزلێنان

وَسِخَ فهو وسِخٌ : پیس بوو

وَسَخٌ (ج أوْساخ) القذر : پیسی

وَسَطٌ (ج أوساط) ما بين طرفيّ الشيء : ناوەڕاست ، ناوەند

وسَطٌ بينةٌ : دەوروبەر ، ژینگە

وَسُعَ صار واسعاً : فراوان بوو

وَسَّعَ المكان أو الشيء ، جعله واسعاً : شوێنەکە یان شتەکەی فراوان کرد

وُسْعٌ طاقةٌ ، قدرَة : هێز، توانا

وَسِعَ كان واسعاً،احتوى: فراوان بوو ، لەخۆی گرت

وَسْواسٌ(ج وَساوس)شيطان،ما يخطر بالقلب وبالعقل: لەعریمەن، ڕاڕایی،وەسواس

وَسِيلَةٌ (ج وَسائِل و وُسُل) ما يُتَقَرَّبُ به إلى الغير ، طريقة : هۆکار ، ڕێگا

وَسِيمٌ (ج وُسَماء و وِسام) جميلٌ : جوان ،

قەشەنگ



وِشاحٌ (ج وُشُح و أوْشِحة و وَشائح) شبه قِلادة من نسيج : گەردانە ، ملپێچ

وَشْمٌ (ج وُشُوم و وشام) غرزُ الإبرة في اليد أو من اعضاء الجسد :خاڵ کوتین لە دەست یان لە لەش

وَشْمٌ أوّل مايبدو من النبات :ڕووەکی تازە شین بوو

وَشْمٌ اليد أو الجسد(ج وشام)غرزه الابرة: خاڵی لەدەستی یان لەسەر لەشی کوتی

وَشْوَشَ الرجلَ : همس إليه كلاماً : قسەیەکی بە گوێ دا چرپاند

وَشَى الثوب : حسّنه بالألوان : جلەکەی ڕەنگاو ڕەنگ کرد

وشى الكلام: كذب فيه : درۆی لە قسەکانی کرد

وَشَى به إلى الحاكم . نمَّ عليه : **زمانی لێ دا**
وَشيكٌ سريع ، قريب : **خێرا ، نزیك**
وِصايَةٌ (ج وِصايا) سيادة بلد على بلد آخر بصورةٍ مؤقَّتةٍ ، وصيّة : **دەسەڵاتداری وڵاتێك بەسەر وڵاتێکی تردا بە شێوەیەکی کاتی ، ڕاسپاردە**
وصَفَ الشَّيء : نعته بما فيه : **وەسفی شتەکەی کرد**
وَصْفَةٌ قائمة أدوية يعيِّنها الطبيب للمريض : **ڕاچێتەی پزیشکی**
وَصَلَ أباهُ ، برَّهُ و أحسَنَ إليه : **چاکەی لەگەڵ دایك و باوکی کرد**
وُصْلٌ (ج أوْصال) كلّ عضو من أعضاء الجسم على حدة : **پەل**
وَصَلَ جمع ، ربط ، أوْصل : **کۆیکردەوە ، بەستیەوە ، گەیاندی**
وُصُولٌ(ج وُصُولات)ورقة يُدرج فيها بيان.ضدّ انطلاق : **قەواڵە، وەصل ، گەیشتن**
وصَّى إلى فلان ، جعله وَصِيّاً : **فڵانە کەسی ڕاسپارد**
وَصِيٌّ (ج أوْصِياء) من يقوم برعاية شؤون القاصر : **سەرپەرشتیاری هەتیو**
وَصِيَّةٌ (ج وَصايا) ما يوصى به : **ڕاسپاردە**
وَصِيفَةٌ (ج وَصائِف) خادمة : **نافرەتی کارەکەر ، خزمەتکار**
وَضُحَ الأمرُ ، ظهر : **کارەکە ڕوون بۆوە**
وَضَحٌ (ج أوْضاح) ضوءٌ ، بياضٌ :**ڕووناکی ، سپی**
وَضَحٌ حليٌّ من الفضّة :**خشڵی زیو**
وَضْعٌ (ج أوْضاع) موضع . حالةٌ : **شوێن ، ڕەوش**
وضُعَ لؤم : **لۆمەکراو**
وُضُوءٌ ماءٌ يُتوضّأ به للصلاة : **ئاوی دەست نوێژ**
وضيعٌ خسيس : **ناکەس بەچە ، هیچوپوچ**
وطأداس. ليَّن : **پەیێ پانی کردەوە، نەرمی کرد**

وطأَ الشَيء ، صيّرهُ وطيناً : **شتەکەی ئاسان کرد**

وطأةٌ موضع القدم : **شوێن پێ**

وَطدَ اثبت ، قوّى : **جێگیری کرد ، قایمی کرد**

وَطَنَ البلد ، اتّخذهُ وطناً و مسكناً يقيم فيه : **کردی بە جێگەی مانەوەی خۆی**

وَطّنَ نفسه على الشيء ، أعدّها لفعْله : **خۆی ئامادی کرد بۆ کردنی شتێك**

وَطن بالمكان ، اقام به : **لە شوێنەکە نیشتەجێ بوو**

وَطنيٌّ منسوب إلى الوطن : **نیشتیمان پەروەر**



وَطَنيّةٌ إخلاصٌ وحُبٌّ للوطن :

**نیشتیمان پەروەریی**

وَطواطٌ (ج وطاوطُ و وطاويطُ) خُفَاشٌ

: **شەمشەمە کوێرە**

وَطيءٌ منخفض ، ليّنٌ سهل : **نزم ، نەرم و ئاسان**

وَظفَ عيّن وظيفة لشخص في شركة : **کەسێکی لەسەر کارێك دامەزراند**

وَظيفةٌ عملٌ ، منصبٌ ،عهدٌ و شرطٌ : **کار ، پۆست ، پەیمان و مەرج**

وعاءٌ (ج اوْعية) إناءٌ : **قاپ ، دەفر**

وَعدَ بالقيام بعمل ، تعهّدَ : **پەیمانی بەکردنی کارێکدا**

وَعْدٌ (ج وُعود) عَهْدٌ : **پەیمان ، بەڵێن**

وعْظٌ نُصحٌ ، تذكير : **ئامۆژگاری ، بیرهێنانەوە**

وعْكةٌ مرَضة : **نەخۆشیی**

وعْيٌ فهْمٌ : **هۆشیاریی**

وعيدٌ تهديد : **هەڕەشە**

وَغْدٌ (ج اوْغاد و وُغْدان) ضعيفُ العقل ، أحمقُ ، خادمُ القوم ، دنيءٌ : کەم عەقڵ ، گێل ، کارەکەر ، کەم وکورت ، بەدکار

وَغىً حربٌ ، ضجيج : شەڕ ، هەراو هۆریا

وَفاءٌ محافظة على العهد : پەیمان پارێزی

وَفاةٌ (ج وفيات) موتٌ : مردن

وفاقٌ إتِّفاقٌ ، وئامٌ : ڕێك کەوتن ، گونجان

وَفَدَ أتى : هات

وَفَّدَ أرْسَل : ناردی

وَفْرٌ (ج وُفُور) غنىٌ، كَثْر : دەوڵەمەندیی ، زۆر

وَفَّقَ اصلح : گونجانی

وَفَّى الشيءَ ، أعطاهُ حقَّه كاملاً : مافی شتەکەی دا

وَفِيٌّ مخلص : دڵسۆز

وَقاحَةٌ قلة الحياء : بێ شەرم و نابڕۆیی

وَقارٌ رزانةٌ : ڕێز و شکۆ

وقايةٌ حمايةٌ :خۆ پاراستن

وَقْتٌ (ج أوْقات) مقدارٌ من الزمن : کات

وَقَّتَ الأمر: جعل له وقتاً : کاتی بۆ کارەکە دانا

وَقُحَ قلَّ حياؤه: بێ شەرم

وَقْعٌ صوتُ الضرب ، سحاب رقيق ، قدْرٌ : دەنگی لێدان ، هەور ، پلەو پایە

وَقَعَ سقط : کەوت

وَقَفَ قام بعد الجلوس : هەستایە سەر پێ

وَقْفٌ قطْعُ الكلمة عمّا بعدها ، ما يحبسه المُحسِن و يتصدَّق به من اي شيء :
وەستانی کۆتایی وشە ، وەقف کردنی شتێك بۆ خێر
وَقْفٌ (ج أَوْقاف) ما يحبسه المْحسن لوقف : وەقف
وَقُودٌ ما تُوقَد به النار :
سوتەمەنی



وَقُورٌ رصين : بەڕێز
وَقَى حمى : پاراستی
وِكالَةٌ تفويض ، اعتماد
: بریکاری، پشت پێ
بەستن
وَكْرٌ (ج اوكار) عش
الطائر : هێلانە
وَكَل فوَّض : کردییە
بریکار
وَكِيلٌ (ج وُكلاء) من يفوَّض إليه أمرٌ من الأمور : بریکار
وَلاءٌ نُصرة ، محبَّة ، صداقة : یارمەتی ، خۆشەویستی ، دۆستایەتی
وِلايَةٌ إمارةٌ : میرنشین
وَلَدٌ (ج أوْلاد و وِلْدة و وِلادة) كل ما ولد : هەموو لە دایك بوویەك
وَلَدَت الأنثى : وضعتْ حملها : سکەکەی دانا
وَلَدَت الأرض : أخرجتْ نباتها: زەوی ڕووەکی شین کرد
وَلْوَل المرأة : أعولتْ و رفعت صوتها بالبكاء : ئافرەتەکە گریان و ڕۆڕۆی کرد
وَلَّى هرب : ڕای کرد
وَلَّى ولاّهُ . جعله والياً : کردییە فەرمانڕەوا



وَلِيٌّ (ج أوْلِياء)كلّ
من ولي امر أحد ،
مُحِبّ ،حليف :
بەخێوکەر، خۆشەویست
، هاوپەیمان
وَلِيدٌ (ج وِلْدان و وِلْدة)
مولودٌ حديث الولادة :
منداڵی ساوا
وَلِيمَةٌ (ج وَلائم) طعامٌ
متّخَذٌ لجمعٍ او لدعوةٍ : خۆراکی میوانان ، دەعوەت
وَهّابٌ كثيرُ العطاء ، من اسماء الله الحسنى : زۆر بەخشندە ، ناوێکی جوانی پەروەردگارە
وَهَبَ أعطى شيئاً من دون مقابل : پێی بەخشی
وَهَجَ إتَّقد : دای گیرساند
وَهْمٌ (ج أوْهام) تصوُّرٌ خاطيءٌ : بیری هەڵە ، وەهم
وَهَمَ تصوَّر ، تخيّل : بەمێشکیدا هات ، خەیاڵی کرد
وَهَنَ ضعُفَ في العمل ، ضعُفَ في البدن : لە کار لاواز بوو ، لەشی لاواز بوو
وَهَنَ أضعف : لاواز بوو
وَيْلٌ حلول الشّر والهلاك ، هلاكٌ ، كلمة يُدْعى بها على منْ وقع في هلكةٍ يستحقها : بەرپابوونی شەڕو لەناوچوون ،لەناوچوون ، واوەیلا




## بابُ اليا ، بەشی پیتی (یاء)

ي الحرف الثامن و العشرون من حروف الهجاء ، **پیتی بیست و هەشتەمینە لە ڕیز بەندی پیتە هیجائییەکان**

يَئِسَ قنط : **نائومێد بوو**

يا حرف نداء للبعيد و القريب : **هۆ**

يَائِسٌ ( يُؤوسٌ) قانِطٌ : **نائومێد**

يَابِسٌ (ج يُبَّس)جاف ، قليل الخير. صُلب، **وشك ، بێ خێر ، ڕەق**

يَابِسة ارض ، بَرّ : **زەوی ، وشکانی**

يَأسٌ قنُوط : **نا ئومێدی**

يَاسَرَ ساهَل . اخذ جهة اليسار : **ئاسانی کرد ، لای چەپی گرت**

يَاسِرٌ (ج أيسار)سهلٌ، جزّار ، جهة اليسار **:ئاسان.سەربڕ.ئەوەی لای چەپ دەگرێ**

يَاسمِين نبات له زهر ابيض طيب رائحة : **گوڵە یاسەمین**

يَافِعٌ (ج يَفَعة و يُفعان) مَن قارب البلوغ : **هەرزەکار**



يافوخ (ج يافيخ و يوافيخ) ملتقى عظْم الرأس : **تەوقە سەر**

ياقوت(ج يواقيتُ) حجر كريم صُلْبٌ: **ياقوت**

يانصيب حظ : **بەخت**

يانِعٌ (ج ينْع) ناضجٌ : **پێ گەیشتوو**

يَباب خراب : **وێران**

يَبَسَ الشيءَ ، جفَّفه : **شتەكەی وشك كردەوە**

يَبِسَ جفَّ : **وشك بۆوە**

يُبُوسة جفاف : **وشكی**

يَتَمَ الصَّبيُ من ابيه ، صار يتيماً : **هەتیو بوو**

يَتِمَ فتر ، ابْطا : **ماندوو شەكەت بوو ، هێواش بوو**

يَتِمَ من الأمر ، انفلت منه : **كارەكە لە دەست دەرچوو**

يَتيمٌ (ج أيتام و يتامى) من فقد أباه في الناس ، من فقد أمه في البهائم : **منداڵی بێ باوك،گیانلەبەری بێ دایك ، هەتیو**



يَتيمَة (ج يتامى) مؤنث يتيم : **كچی هەتیو**

يَخْتٌ (ج يخوت) سفينة فخْمة للتَّنزّه : **كەشتی گەورەی گەشتیاری**

يَدٌ (ج يُدي و أيدٍ) جاه ، قدر ، استسلام : **شكۆمەندی ، دەسەلأت ، خۆبەدەستەوەدان**

يَد (ج ايدٍ و يُدي) كفٌّ ، نعمة ، إحسان : **دەست، نیعمەت ، چاكەكاری**

يدويّ نسبة إلى يد : **دەستیی ، كاری دەست**

يراع قلم ، قصب يُزمَر فيه الراعي ، جبانٌ : **پێنوس ، شمشاڵ ، ترسنۆك**



**يراعة** قصبةٌ ينفخ فيها الراعي ، قلم ، أحمقُ :
**شمشاڵ ، پێنوس ، گێل**

**يربوع** (ج يرابيع) حيوان يشبهُ الفأر :**گیانلەبەری گۆڕ هەڵکەنە**

**يرقان** آفة تصيب الزرع و الإنسان و تسبب اصفراراً :**نەخۆشی زەردوویی ، زەرتك**

**يَسار** (ج يُسُر و يُسْر) سهولةٌ وغنىً : **ئاسانی و دەوڵەمەندی**

**يَسَّرَ** الأمر ، سهّلهُ : **کارەکەی ئاسان کرد**

**يَسُرَ** الامر ، سَهُل : **کارەکە ئاسان بوو**

**يَسَرَ** جاء عن اليسار ، انقاد ، خضع : **لەلای ڕاست هات ، ڕابەری کرد ، ملکەچ بوو**



**يُسْرٌ** سُهولة ، غنىً: **ئاسانی ، دەوڵەمەندی**

**يُسْرَى** (ج يُسْرَيات) جهة اليسار : **لای ڕاست**

**يَسِيرٌ** قليل،سهلٌ :**کەم ، ئاسان**

**يَعْسُوبٌ** (ج يعاسيب) ذكرُ النحل : **نێرە هەنگ**

**يَعْفُورٌ** (ج يعافير) غزال : **مامز ، ئاسك**

**يَقْطِينٌ** قرعٌ مستدير كالبطّيخ : **کولەکە ، کودی گەورە**

**يَقِظَ** فطن ، حذر ، صحا : **حاڵی بوو ، وریا بۆوە ، لە خەو هەڵسا**

**يَقِظٌ** (ج أيقاظ) يقظانٌ ، متنبّه للأمور : **هۆشیار ، وریا**

**يَقَظَةٌ** فطنة ، ضد النوم : **وریایی ، بە ئاگایی**

**يَقِنَ** الأمرُ ، وضُح ، ثبت : **کارەکە ڕوون بۆوە ، جێگیر بوو**

**يَقِينٌ** زوالُ الشكّ : **دڵنیایی**

**يَقِينٌ** منه : صدقٌ لا شك فيه : **لێ دڵنیا بوون**



يَمٌّ (ج يُمُوم) بحرٌ ، دەریا
يمامٌ قَصْدٌ ، حمام برّي
:مەبەست ، کۆتری کێوی
يمانيٌّ منسوب إلى بلاد "اليمن"
: یەمەنی ، خەڵکی وڵاتی
یەمەن
يمَنَ عمل بيده اليمنى :
بەدەستی ڕاستە کاری کرد
يُمْنٌ بركةٌ : پیت و فەڕ
يمَّنَ ذهب ذات اليمين، برّك : بەرەو لای ڕاست ڕۆی ، بە پیت و فەڕی کرد
يُمْنَى ضد يسرى : ڕاستە
يَمَنِيٌّ منسوب إلى "اليمن" : یەمەنییەك
يمينٌ (ج أيْمُن و أيْمان) ضدّ يسار ، ذو يُمْن و بركة ، حلف : ڕاستە،بە پیت و فەڕ ، سوێند
يَنْبُوعٌ نَبْعٌ : سەرچاوەی ئاو ، کانی
ينَع الثمرُ ، حانَ وقت قطافهُ : بەروبوومەکە پێگەیشت
يَهُودٌ أتباع الديانة اليهوديّة : جوولەکە
يَهُودِيَّةٌ ديانة سماويّة : ئاینی جوولەکە ، یەهودی
يُودٌ جسمٌ بسيط سريع التبخُّر : ماددەی یۆد
يَوْمٌ (ج أيّام) ليلٌ ونهارٌ : شەوو ڕۆژ

# پێڕست